پرۆگرامی پەروەردەیی منداڵان

# بەرنامەی پەروەردەیی نەوجەوانان

ئامادەکردنی : محمد سینەمۆکی

قۆناغی سێیەم

١٤١٧ ك ١٩٩٧ز

پرۆگرامی پەروەردەیی منداڵان، پێک هاتووە لە زنجیرەیەکی چوار ئەڵقەیی، بەناوی (بەرنامەی پەروەردەیی منداڵان)و، دابەش کراوەتە سەر چوار قۆناغ: قۆناغی یەکەم: بۆ قۆتابییانی پۆلی (یەکەم و دووەم و سێیەم)ی سەرەتایی ئامادەکراوە. قۆناغی دووەم: بۆ قوتابییانی (چوارەم و پێنجەم و شەشەم)ی سەرەتایی ئامادە کراوە. قۆناغی سێیەم و چوارەم: بۆ نەوجەوانان و لاوانی دوای (١٢) ساڵی ئامادە کراوە.

# پێشەکی

# بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله وعلى آله وصحبه الكرام

مادام لاوان رۆڵی سەرەکی دەبینن لە گۆڕانکارییە رامیاریو کۆمەڵایەتییەکانداو جڵەوی کۆمەڵگە بەدەستیانەوەیە بەرەو هەر مەنزڵێکی بەرن بەختەوەری بێت یان ترسناکی، وە ئەوان لەنێو کۆمەڵدا نالیەتێکی بەرچاون لە جێبەجێ کردنی ئەم ئایەتە پیرۆزەدا ﴿ان الله لا يغير ما بقوم حتى يغيروا ما بانفسهم﴾ ئیتر گۆڕانکاریەکە سلبی بێت یان ئیجابی.

کەواتە دەبێت بایەخێکی زیاد بە ئەوجەوان ولاوەکانمان بدەین و بەرنامەی دروستیان بۆ دابڕێژین، ڕێگە ئەدەین بۆ ئامانج لە ژیانیاندا بسوڕێنەوە یاخود خەڵکێکی دەروون نەخۆش بەبیرو بۆچوونی خوار بەرەو هەڵدێریان ببات.

هەروەها دەبێت ئەو ئەوجەوانانە فێری ئیسلام بکەین بە جۆرێک دڵنیابن لەوەی کێشەی تاک و کۆمەڵی گەلەکەمان لای ئیسلام چارەسەر دەکرێت، بەڕادەیەکیش هۆشیاریان کەینەوە بە دەوروبەرو واقیعەکەیان ئاشنا ببن تا خۆیان بە هاوەڵانی ناو ئەشکەوتەکە نەزانن. جا ئەگەر ئەو دوو خاڵەمان لەگەڵیاندا ئەنجام دا، ئەو کاتە باشتر لە واقیع و دینەکەیان حاڵی دەبن و بەگوێرەی واقیع حوکم لە قورئان و سوننەتی پێغەمبەرەوەﷺ وەردەگرن. وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قل هذه سبيلي أدعو الى الله على بصيرة أنا ومن اتبعني﴾يوسف ١٠٧ بۆیە دەبینین دەربارەی واقیع زانایانمان دەفەرموون فەتوا بەگوێرەی شوێن و کات و کەس دەگۆڕێت.

لێرەدا مەبەستمان ئەوە نییە دەبێت سەرجەم لاوەکانمان (مجتهد) بن بەڵکو دەڵێین: با هەرکەس بەڕادەی ئاستی تەمەن و واقیعەکەی خۆی تێگەشتنی لە ئیسلام هەبێت، تاوەکو

هەنگاوەکانمان دروست بن و نەکەوینە هەڵەوە، وەکو چۆن ئیمامی عمر کە تەوجیهی دەنارد بۆ ئەبو موسای ئەشعەری -خوایان لێ رازی بێت- پێی دەفەرموو: ((**الفهم الفهم فيما ادلى اليك**)).

لەکاتێکدا منیش چاوم بە قۆناغی سێیەمی پەروەردەی نەوجەوانان کەوت دڵخۆش بووم وباوەڕم کرد ئەگەر ئەم بەرنامەیە پیادە بکرێت بەشێکی فراوانی ئەو باسانەی سەرەوەمان هەنگاو بۆ ناوە بۆیە بە پێویستم زانی ئەو هەوڵ و بۆچوونانە هان بدرێت و دەست خۆشی لە خاوەنەکانیان بکرێت، تاوەکو بە پەرۆشتر لە کارەکانیاندا قاڵ ببن.

ئەوەشی زیاتر جێگەی دڵخۆشیە ئەم بەرنامەیە مامۆستا محمد سینەمۆکی نوسیویەتی بە یارمەتی دەستەیەک هاوکاری دڵسۆز کە هەموویان لاون و بیرو بۆچونەکانیان هەڵقوڵاوی واقیعی ئەمڕۆی کوردستانی خۆشەویستەو ڕەچاوی ئاستی ئەو تەمەنەی تیادا کراوە کە بەرنامەکەی بۆ داڕێژراوە.

لەخوای گەورە دەخوازین پاداشتی خێری کاک محمدو هاوکارانی بداتەوەو سەرکەوتوویان بکات لە پرۆژە بە پیزەکەیاندا.

**﴿والذين جاهدوا فينا لنهدينهم سبلنا وان الله لمع المحسنين﴾العنكبوت/٦٨.**

**وصلى الله على محمد وعلى آله وصحبه وسلم**

**ناظم عبدالله**

**هەولێر**

**١٤١٧ک ١٩٩٧ز**

# بسم ا لله الرحمن الرحيم

ان الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات اعمالنا، من يهد ا لله فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادي له، وأشهد أن لا اله الاّ ا لله وحده لا شريك له وأشهد أنّ محمداً عبده ورسوله.

﴿يا أيها الذين آمنوا اتقوا ا لله حق تقاته ولا تموتنّ الا وأنتم مسلمون﴾ آل عمران/١٠٣.

﴿يا أيها الناس اتقوا ربكم الذي خلقكم من نفس واحدة وخلق منها زوجها وبثّ منهما رجالاً كثيراً ونساءاً واتقوا ا لله الذي تساءلون به والأرحام ان ا لله كان عليكم رقيباً﴾ النساء/١.

﴿يا أيها الذين آمنوا اتقوا ا لله وقولوا قولاً سديداً يصلح لكم أعمالكم ويغفر لكم ذنوبكم ومن يطع ا لله ورسوله فقد فاز فوزاً عظيماً﴾ الأحزاب/٧١.

أما بعد: فان اصدق الحديث كتاب ا لله وخير الهدي هدي محمدﷺ وشر الامور محدثاتها فان كل محدثة بدعة وكل بدعة ضلالة وكل ضلالة في النار.

# چەند سەرنجێک بۆ مامۆستای بانگخواز

بانگخوازان پێویستە خاوەنی کۆمەڵە ڕەوشتێکی تایبەتی بن یەکەم بۆ وەدەست هێنانی ڕەزامەندی خوای خۆیان و پاشان بۆ گەیشتنیان بە ئامانجەکانیان لەو ڕەوشتانە:

١- پێویستە بانگخواز هەست بە گرنگیو گەورەیی کارەکەی بکات و یەکەم هەنگاوی دامەزراندنی عەقیدەو بیرو باوەڕێکی راستەقینە بێت لە دڵی قوتابیاندا.

٢- پێویستە مامۆستای بانگخواز بزانێ کە کاری بانگەوازی چاکترین هۆکارە بۆ گەیاندنی نورو رۆشنایی حەق و ڕاستی بە دڵان.

٣- پێویستە بزانێ کە گەورەترین پاداشت کە دەستی دەکەوێ بەهۆی ئەنجام دانی کاری بانگەوازی کردنەوەیە.

٤- پێویستە بزانێ کە گەورەترین بنچینەیەک کە یارمەتی خوای بۆ کێش دەکات و سەرکەوتنی خوای بۆ نزیک دەکاتەوە بریتی‌یە لە دڵسۆزی ڕاستەقینە بۆ خوای گەورە وە دوور بوون لە هەموو سیفەتە بەدو خراپەکان لە ڕووپامایی‌و غرورو عجب و حب الظهور... هتد.

٥- دەبێت چاکترین شێوازی گەیاندن بەکار بێنێ لە بانگەوازەکەیدا وە بۆ سەرکەوتنیشی دەبێ بە تەواوی مانای (حکمەت) ڕەچاو بکات لە چۆنیەتی بانگەوازی کردنەکەیدا.

٦- وە بزانێ چۆن دەچێتە ناو دڵان و دەرگا داخراوەکان دەکاتەوە، وە دەبێ لەگەڵ دڵ و ویژدانیشدا ژیریو عەقڵیشی بجولێنێ تاوەکو شوێنەواری قسەکانی زیاتر بمێنێتەوە لە سەریان.

٧- دەبێت قسەکانی لە قوڵایی دڵەوە هەڵقوڵێت چونکە بێ گومان ئەوەی لە دڵەوە دەرچێ دەگاتە دڵ بەڵام ئەوەی لە زمانەوە دەرچێ لە گوێچکە تێپەڕ ناکات.

٨- سروشت و تەبیعەتی خەڵک و ناوچەکە بزانێ تاکو قسەکانی گونجاوو واقعی بن لەگەڵیانداو بەپێی ئاستی ژیریو زانیاری ئەوان بدوێ لەگەڵیاندا.

٩- باسەکانی بابەتی بن هەر تیرەی لە کەندالێکی نەدات وە ئەو باسانەی کە دەیەوێت بە خەڵکیان بگەیەنێت دیاریان بکات و زیاتر ڕوونیان بکاتەوەو داکۆکیان لەسەر بکات ئنجا هەوڵ

بدات لە کۆتایی باسەکانیدا پوختەی ئەو شتانەی باسی کردووە بە کورتی دووبارە بکاتەوە تاوەکو باسەکە بەجوانی بخاتە ناو دڵ و مێشکی قوتابیانەوە.

١٠- دەبێت زۆر جاران بابەتە گرنگەکان دووبارە بکاتەوە بۆ قوتابیان بەڵام بە شێوازی جیاجیا چونکە هەموو دووبارەکردنەوەیەک سوودو کەڵکی تایبەتی خۆی هەیە.

١١- وە پێویستە لەسەر بانگخواز بەهێزترین و ڕاسترین بەڵگە هەڵبژێرێت بۆ پاڵپشتی قسەکانی چونکە مەیدانی بەڵگە هێنانەوە زۆر فراوانە، ئینجا چاکتر وایە بەم شێوەیە بەڵگەکان بهێنێتەوە: (قورئانی پیرۆز- فەرموودەی صەحیح- ژیان و سیرەی پێغەمبەری ئازیزﷺ- ئنجا مێژووی ئیسلامی...هتد.).

١٢- هەمیشە هەوڵی خۆپڕ چەک کردن بە زانیاریو علم بدات و توێشووی ڕێگاکەی بە لەبەرکردنی قورئان و فەرموودەو ووتەی صحابەو علماء... تا زیاتر لەکاری بانگەوازەکەیدا سەرکەوتوو بێت.

١٣- پێش ئەوەی بە گوفتارەکانی خەڵکی بانگ بکات بە ڕەفتارەکانی خەڵکی کێش بکات و سەرمەشق و مامۆستایەکی ڕەوشت بەرزو خوو پەسەندو ئاکارو ڕەفتار جوان بێت.

١٤- هەوڵ بدات هەموو گوفتارو ڕەفتارەکانی هەڵێنجراوی قورئان و سوننەتی صەحیح بن تا بیرو بۆچوونی خەڵکیش ڕاست و دروست دەرچێت.

١٥- هەستی خەڵکی بریندار نەکات و ڕاستەوخۆ هێرش نەکاتە سەر ئەو شتە پوچەڵانەی کە لای قوتابی گەڵاڵە بووە، بەڵکو پێویستە بە (تدرج) هەنگاو بە هەنگاو ئەو کارە ئەنجام بدات و بە شێوازێکی ناڕاستەوخۆ کەم و کوڕیەکانی چارەسەر بکات.

١٦- هەمیشە باس لە ئیجابیات بکات وەکو برایەتیو یەکڕیزیی موسڵمانان و خۆش ویستنی موسڵمانان لەبەر خواو یارمەتی دانی موسڵمانان لەسەر چاکە، نەک باسی پەرتەوازەیی وجیاوازیو کێشەکان... بکات بەڵکو قوتابیان هەر لە سەرەتاوە ڕابێنێت لەسەر ئەوەی کە کاری موسڵمانان بریتیە لە کۆکردنەوەی هەموو تواناکان بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمنانی خواو پێغەمبەرو موسڵمانان.

١٧- دەبێت زۆر بەسۆز بێت لە بەرامبەر خەڵکیداو سوور بێت لەسەر ڕزگار کردنیان و دەرهێنانیان لە زەلکاوی نەفامیەوە بۆ سەر شاڕێگەو ڕاستە شەقامی ئیسلام و هەموو

ناڕەحەتیو ئازارەکانی ئەو ڕێگەیە هەڵبگرێت و بەردەوام و لێبڕاو بێت.

١٨- وە کاتی گونجاوو لەبار هەڵبژێرێت بۆ قوتابیەکانی لەگەڵ بابەتی گونجاو بەو کاتەوە وە خۆی ڕابێنێ کە بەهیچ جۆرێ دوا نەکەوێ لە (موعد)ی خۆی چونکە متمانەی کەم دەبێتەوە لە دڵی قوتابیانیدا.

١٩- زیاتر بایەخ بە چۆنێتی (**نوعیة**) بدات نەک بە چەندێتی (**کمیة**) چونکە زۆر جار کەمی پوخت زیاتر سوودی لێ دەبینرێ تاوەکو زۆری بۆر، ئنجا نابێ بانگخواز چاوەڕێی خەڵکێکی زۆر بکات تا قسەیان بۆ بکات بەڵکو دەبێ لە کەمەوە دەست پێ بکات پاشان وردە وردە دەگاتە زۆر (**ان الجبال من الحصی**).

٢٠- پێویستە لە میانەی قسەکانیدا مەدحی خۆی نەکات و ووشەی (من، من) بەکار نەهێنێو دەبێت هەموو کارە چاکەکانی خۆی بگێڕێتەوە بۆ چاکەو (**فضلي**) خوای گەورە.

٢١-هەروەها قوتابیەکانی فێری عیبادەت و خووڕەوشتێکی پەسەند بکات و ڕایان بێنێ لەسەر هەموو سیفاتێکی جوان و مەردانەی وەکو خۆگریو نەپسان و بەنەمەک و وەفاو لێ بووردەییو گوێ گرتن و بەگوێ کردن و سەخاوەت و (جیهاد).... هتد.

٢٢- پێویستە لەسەری موراعاتی ئەو پەردەی شەرم و ڕێزەی کە هەیەتی بکات لەلای بانگ کراوەکە.

٢٣- دەبێت بانگ کراوەکە وا لێ بکات کە کەسانی تریش لەگەڵ خۆیدا بێنێو ڕێنمونیان بکات.

٢٤- پێویستە مامۆستا بەردەوام قوتابی ڕا بێنێت لەسەر خوێندنەوەی کتێب و نامیلکەی بەسوودو گوێ گرتن لە شریت و کاسێتی بەکەڵک، وە چاکتر وایە بۆ خۆی بۆیان دیاریو ئامادە بکات.

٢٥- پێویستە مامۆستای بانگخواز قوتابیانی ڕابێنێ کە خۆیان بپارێزن لە بەکار هێنانی ئەو ووشە هەڵانەی کە بڵاون لەسەر زمانی خەڵکیو بەکار هێنانیان شەرعی نیە یان پێچەوانەی بنەمایەکی ئیسلامیە لەوانە:

(یەزدان) کە ووشەیەکی فارسیەو بە مانا خوای چاکە (الە الخیر) دێت چونکە ئاگر پەرستەکان بڕوایان وابوو کە دوو خوا هەیە (خوای چاکە= الە الخیر= یەزدان) وە خوای خراپەو

شەڕ (اهرمن) کەواتە بەکارهێنانی (یەزدان) شەرعی نیە.

٢٦- پێویستە لەسەری هەوڵ بدات ئەو کەسانە بناسێت کە دەیانەوێت قوتابیەکان لاڕێ بکەن و گومان و دوودڵی بخەنە ناویانەوەو بەرەو خۆیان کێشیان دەکەن.

٢٧- پێویستە مامۆستای بانگخواز قوتابیەکانی لەگەڵ خۆیدا بگێڕێ بۆ بانگ کردنی کەسێکی تازە تا ئەوانیش لەمەوە فێری کاری بانگەوازیو چۆنیەتەکەی ببن.

٢٨- پێویستە هەموو ئەو هۆکارانە بەکار بێنێ کە خۆشەویستی دروست دەکات و گەشەی پێ دەدات لەگەڵ دەربڕینی سۆزو خۆشەویستیو بەزەیی. کەواتە: پێویستە مامۆستایەکی دڵسۆز بێت لە زانستداو باوکێکی بەبەزەییبێت لە تعاملدا وە برایەکی گەورە بێت لە یارمەتی داندا.

٢٩- گوێ گرتن لە هەموو ڕاو بۆچوون و پێشنیازێک با لەگەڵ بۆچوونی خۆشیدا نەگونجێ.

٣٠- دوور کەوتنەوە لە شێوازی (تعلیق) دان و گاڵتە پێ کردن و سوک سەیرکردن و هێرش کردنە سەر کەسانی دیاری کراو.

٣١- پێویستە ئامادەو پابەندبێت بەو پەیمان و وەعدانەی کە دەیدات و ڕاست گوتن لە هەموو حاڵەتێکدا. کەواتە: با بیر لەوە نەکاتەوە خەڵکی عوزرو بیانوی بۆ بێننەوە بەڵکو بیر لەوە بکاتەوە چۆن وەعدو بەڵێنەکەی جێ بەجێ بکات.

٣٢- پێویستە مامۆستای بانگخواز قوتابیەکانی لەسەر نهێنی (اسرار) پێدان پەروەردە نەکات و بەپێ ی پێویست و ئاستیان نەبێت نهێنیيان لا باس نەکات چونکە کورد گوتەنی: (ڕازت لای یەکیو پرست لای هەزار).

٣٣- قوتابیەکانی حاڵی بکات کە هیوایەت و ئاواتەکان و ئامانجەکان لەدوای ناڕەحەتیو نەشکەنجەو ئازاردا دێنە دی، چونکە هیوایەتەکانی (مدینە) نەهاتنە دی تەنها لەدوای ئازارەکانی (مەککەوە) نەبێت (لم تتحقق آمال المدينة الاّ بعد آلام مكة).

٣٤- قوتابیەکانی ڕابێنی لەسەر رەخنەو تێبینیو پێشنیاز دەربڕین چونکە بەگوێ گرتن لە شتەکانیان زیاتر هەست بە بوونی خۆیان دەکەن.

٣٥- پێویستە کاتێ هەستی کرد کە قوتابیەکان لەسەر دەستی ئەم بەرەو پێش ناچن یا ئەرکەکان جێ بەجێ ناکەن بە پەلە سەروی خۆی ئاگادار بکاتەوە لەم کارە تا قوتابیەکان لای

ئەم بگوێزرێنەوە لای کەسێکی تر بەڵکو لەسەر دەستی ئەو گەشە بکەن چونکە بەردەوام بوون لەسەر ئەم حاڵە متمانە ناهێڵێ لەنێوان مامۆستای بانگخوازو قوتابیەکاندا.

٣٦- چاوپۆشی بکات لە هەندێ لە هەڵەو کەم و کوڕی قوتابیان و بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ سەر زەنشتیان نەکات و سزایان نەدات بەڵکو بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆو لە ڕێگەی پەندو چیرۆک و بەسەرهاتی پیاو چاکان و خواناسانەوە ئامۆژگاریان بکات و هەڵەکانیان ڕاست بکاتەوە.

٣٧- پێویستە خۆی بپارێزێت و خۆی دوور بگرێت لە گاڵتەو گەپ و پێکەنینی زۆر چونکە ئەمە سام و هەیبەتی لادەبات و ڕێزی کەم دەکاتەوەو پەیوەندی لەگەڵ قوتابیاندا لاواز دەبێت و پەردەی شەرم و شکۆ نامێنێت لەنێوانیاندا.

٣٨- پێویستە مامۆستای بانگخواز ووشەی پاراوو جوان و گونجاو بەکار بێنێ بەبێ پەنا بردنە بەر زۆر لەخۆ کردن و (**تكلف و تصنع**!!).

٣٩- خۆ بەکەم گرو (**متواضع**) بێت و هەمیشە نمونە بە خەڵکی تر بهێنێتەوە نەک بەخۆی چونکە خۆ هەڵنان و باس کردنی خۆ ڕێز کەم دەکاتەوەو مرۆڤ سوک دەکات بەڵکو زیاتر بچوکتر دەبێتەوە لەبەر چاوی قوتابیان چونکە خۆ بەزل زان وەکو باڵندە وایە تا زیاتر بەرز بێتەوە بە ئاسماندا لەچاوی خەڵکیدا بچوکتر دەبێتەوە، هەر وەکو نابێت لەبەر چاوی قوتابیان خۆی بشکێنیو زەمی خۆی بکات چونکە زەمی خۆ خۆهەڵنانە.

٤٠- پێویستە مامۆستای بانگخواز ئاگاداری کات و شوێن و هەلی ڕەخساو بێت بۆ وانە وتنەوە بە قوتابیەکانی!!

# قۆناغی سێیەم

کە قوتابیانی پۆلی یەکەم و دووەم و سێیەمی ناوەندی دەگرێتە خۆی یان هەر لاوێک کە لە هەمان ئاستدا بێت.

# بەشی فێرکردن: (( قسم التعليم ))

دوای ئەوەی مامۆستا لە بەشی فێرکردنی قۆناغی دووەمدا قوتابی فێری خاڵە دیاری کراوەکانی ئەو قۆناغە کرد، هەڵدەستێت بەفێرکردنی قوتابیان و لاوان لەم قۆناغەدا بەم شێوەیەی خوارەوە:

## ١- خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز:

پێویستە مامۆستا لەم قۆناغەدا قوتابی بە لایەنی کەمەوە فێری خوێندنەوەی جزمی (٢٤- ٢٥- ٢٦- ٢٧) بکات چونکە قورئان لە رۆژی دواییدا دەبێتە تکاکاری خاوەنەکەی هەروەکو پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: ((اقرأوا القرآن فانه يجيء يوم القيامة شفيعاً لصاحبه))[1].

## ٢- چاک خوێندنەوە (( تجويد ))ی قورئانی پیرۆز:

پێویستە لەسەر مامۆستا هەموو یاساکانی ((تجويد)) فێری قوتابی بکات بەچاکی.

## ٣- لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز:

أ- پێویستە مامۆستا قورئانی پیرۆز بە قوتابی لەبەر بکات بەپێی ئاستی قوتابیان بە مەرجێک لە جزمی ((عمّ))و ((تبارك)) کەمتر نەبێت.

عن ابن عباس (رض) عن النبيﷺ قال: ((ان الذي ليس في جوفه شيء من القرآن كالبيت الخرب))[2]. واتە بێ گومان ئەو کەسەی کە هیچ لە قورئان لە سنگیدا نییە وەکو کەلاوەیەکی وێران وایە.

ب- پێویستە مامۆستا بە بەردەوامی لە قوتابیان بپرسێتەوە بۆ ئەوەی ئەو بەشەی

---

[1] رواه مسلم.

[2] رواه احمد والحاكم والترمذي وصححه.

لەبەریان کردووە لەبیریان نەچێتەوە چونکە لەبیر چونەوەی قورئانی پیرۆز گوناهێکی گەورەیە هەروەکو پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت کە ئەنەس لیی دەگێڕێتەوە:

((عرضت عليّ ذنوب أمتي فلم أر ذنباً أعظم من سورة من القرآن أو آية أوتيها رجل ثم نسيها))[٣].

واتە/ گوناهەکانی ئوممەتەکەم پێشان درا ئنجا ئەم دیت لەوە گەورەتر کە پیاوێك سورەتێك یان ئایەتێك لە قورئان لەبەر بکات پاشان لەبیر خۆی بەرێتەوە.

## ٤- شارەزابوون لە واتای ووشەکانی قورئانی پیرۆز:

پێویستە مامۆستا هەوڵ بدات کە قوتابی شارەزا بکات لە مانای ووشەکانی قورئانی پیرۆز ئەمەش بەوە دەبێت کە مامۆستا هەر جارەی چەند ووشەیەکی عەرەبی شی بکاتەوەو بە قوتابی لەبەر بکات تاکو لە داهاتوودا قوتابی لە قورئانی پیرۆز تێ بگات و شارەزای ببێت.

## ٥- رازاندنەوەی قورئانی پیرۆز بە دەنگی خۆش:

پێویستە مامۆستا قوتابی ڕا بهێنێت لەسەر خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز بە دەنگی خۆش بەپێی توانا هەروەکو ((ابو هريرة)) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێت: ((ليس منا من لم يتغن بالقرآن))[٤].

واتە/ لە ئێمە نیە هەر کەسێك کە قورئان نارازێنێتەوە بە دەنگی خۆش.

## ٦- شارەزا بوون لە ڕێنوسی قورئانی پیرۆز:

پێویستە مامۆستا قوتابی فێری شێوازی نووسینی ووشەکانی قورئانی پیرۆز بکات تاوەکو قوتابی بتوانێت ڕێنووسی ((املاء)) ووشەکانی قورئانی پیرۆزو ئایەتەکانی لە کاتی پێویستدا بکات.

---

[٣] رواه الترمذي وابو داود

[٤] اخرجه البخاري

# وانەی یەکەم:

# گرنگی باوەڕو عەقیدە لە ئیسلامدا

خوای گەورە لە ناردنی یەکەم پێغەمبەرەوە تاکو دوایین پێغەمبەر یەکەم فەرمان کە پـێی سپاردوون بریتی بووە لە بواری بیروباوەڕو عەقیدە هـەر بۆیـە سـەرجەم پێغەمبـەران بنچینـەی ئایینیان یەك بووەو خۆی لەم بوارەدا دیتۆتەوە.

هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿**وما أرسلنا من رسول الا نوحي اليـه انـه لا الـه الا أنا فاعبدون**﴾[٥].

واتە/ هـەر پێغەمبـەرێکمان ناردبێت وەحـیو نیگامـان بـۆ کـردووە کـە هـیـچ پەرسـتراوو خوایەکی بەڕاستی نییە جگە لە خۆم کەواتە بم پەرستن. وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿**وان هـذه أمتكم أمة واحدة وأنا ربكم فاتقون**﴾[٦].

باوەڕو عـەقیدە لـە ئیسـلامدا بـەرزترین پلـەو پایـەی هەیـەو گرنگـترین بەشـیەتی چونکـە بنچینـەی هـەموو بەشـەکانی تـرەو ئەگـەر ئیسـلام بـە خاویـەك دابنێـین بـاوەڕو عـەقیدە بناغەکەیەتیو ئەگەر وەك درەختێك تەماشای بکەین ئەوا باوەڕو عـەقیدە ڕەگ و ڕیشـەیەتیو ئەگەر بە جەستەیەکی دابنێین باوەڕو عەقیدە پەیکەری نیسکیەتی[٧] هەر بۆیـەش نزیکـەی سـێ لەسەر چواری (٣/٤)ی قورئانی پیرۆز کە لەشاری مەککەدا هاتووەتە خوار زۆربەی دەربـارەی بـاوەڕو عـەقیدەو بنچینـە گرنگەکانیـەتی لـە شـاری مەدینەشـدا جـار لـەدوای جـار دووپـاتی بەردەوامی لەسەر ڕوونکردنەوەو چەسپاندنی بـاوەڕ کـراوە هـەر بۆیـەش تەمـەنی پـیرۆزی ٢٣ سالەی پێغەمبەرایەتی پێغەمبـەر (١٣) سـالی تـەواوی بـۆ چەسـپاندن و ڕوونکردنـەوەی ئـەو مەسەلە گرنگ و مەزنە تەرخان کرا بوو. کەواتە پێویستە دڵنیابین کە دامـەزراندنی بـاوەڕ لـە

---

[٥] الأنبياء/٢٥

[٦] المؤمنون/٥٢.

[٧] نیسکیەتی: واتە: نیسقانیەتی.

دڵ و دەروون و ژیری کۆمەڵێکدا کە دەویسترێت کۆمەڵگایەکی ئیسلامیو کیان و قەوارەیەکی ئیسلامییان لێ پێک بهێنرێت یەکەمین و گرنگترین هەنگاوەو پێش ئەوە نابێت هیچ هەنگاوێکی دیکە بنرێت ئەگینا کارەکە پووچەڵ و بێ ناوەرۆک دەبێت و بێ بەرهەم و بێ کەڵک دەردەچێت.

وە دەبێت دڵنیابین کە هەتا باوەڕو عەقیدە قووڵترو پتەوترو دامەزراوتر بێت پابەندیو موسڵمانەتیش چاکترو تەواوترو هەمە لایەن تر دەبێت.

## * تاک و تەنیایی خوای گەورە ((وحدانية الله تعالى)):-

پێویستە باوەڕمان وابێ کە خوای گەورە تاک و تەنیایەو هاوەڵ و هاوبەشی نییە نە لە زات و سیفەتداو نە لە پەروەردگاریەتیداو نە لە خوایەتیو پەرستندا. هەر بۆیە یەکەم بانگەوازی سەرجەم پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) بۆ خوا بەیەک زانین و یەک خواناسین بووە.

## * جۆرەکانی یەک خواناسین (انواع التوحيد)

یەکەم/ یەکتاپەرستی خوا لە پەروەردگاریەتیدا ((توحيد الله في الربوبية)):

مەبەست لەم جۆرە یەکتاپەرستییە ئەوەیە بڕوامان وا بێت کە تەنها خوای گەورە دروستکەرو بەدی هێنەری ئەم بوونەوەرەیە بە ئاسمان و زەویو گیاندارو بێ گیانەوە وە تەنها خوای گەورە بەڕێوەبەری یاساکانی ئەم بوونەوەرەیەو هەر خۆی دەمان ژیێنیو دەمان مرێنیو ڕۆزیمان دەدات و هەر ئەو هەژارو دەولەمەندمان دەکات و... هتد. هەروەک خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿الله خالق كل شيء وهو على كل شيء وكيل﴾[٨].

واتە/ خوای گەورە دروست کەرو داهێنەری هەموو شتێکەو هەر خۆی بەسەر هەموو شتێکدا بە دەستەلاتە. وە هەروەها دەفەرموێت: ((قُلْ أَغَيْرَ اللهِ أَبْغِي رَبًّا وَهُوَ رَبُّ كُلِّ شَيْءٍ))[٩].

---

[٨] الزمر/٦٢.

[٩] الأنعام/١٦٤.

واته بلّێ ئایا جگه له (ا لله) پەروەردگارێکی ترم بوێت؟ ئەو خوایه پەروەردگاری هەموو شتێکه.

وه هیچ کەسێک له کۆن و تازەدا نکوڵی لەم جۆره یەکتاپەرستی‌یەی نەکردووه جگه له کۆمەڵانێکی زۆر کەم نەبێت.

دووەم/ یەکتاپەرستی خوا له خوایەتی ((**الألوهية**))و پەرستندا (**العبادة**)

مەبەست لەم جۆره یەکتاپەرستی‌یه ئەوەیه که باوەڕمان وا بێت تەنها خوای گەوره مافی پەرستن (**العبادة**)و دادو فەرمان ڕەوایی (**الحاكمية**) هەیه هەروەکو خوای گەوره دەفەرموێت: ﴿**وما أمروا الاّ ليعبدوا الهاً واحداً لا اله الاّ هو سبحانه عمّا يشركون**﴾[10].

واته/ فەرمانیان پێ نەکرابوو تەنها بۆ ئەوه نەبێت که یەک خوا بپەرستن و بەندایەتی بۆ بکەن هیچ خوایەکی تری بەڕاستی نی‌یه جگه لەخۆی وه پاکیو بێ گەردی بۆ خوایه لەو هاوبەشی پەرستی‌یەی که ئەوان دەیکەن.. هەروەها دەفەرموێت: ﴿**ولا يشرك في حكمه أحداً**﴾[11].

واته/ خوای گەوره هیچ شتێک ناکاته هاوەڵ و هاوبەشی له بڕیاری خۆیدا کەواته جگه له خوا هیچ پەرستراو (معبود)ێکی بەڕاستی نی‌یه که مافی حەرام و حەڵاڵ کردنی هەبێت ئنجا بزانه که ئەم جۆره یەکتاپەرستی‌یه زۆر گرنگه چونگه زۆر کەس لێرەدا گومڕا دەبێت و وا دەزانێت که جگه لەخوا کەسی تر هەیه مافی پەرستن و دادو فەرمانڕەوایی (**حاكمية**)ی هەبێت و ئەتوانێت یاسای حەرام کردن و حەڵاڵ کردن دابنێت بێ گومان ئەمەش گومڕا بوونێکی ئاشکرایه.

سێیەم/ یەکتاپەرستی خوا له ناوو سیفەتەکانی ((**توحيد ا لله في الاسماء والصفات**)):

مەبەست لەم جۆره یەکتاپەرستی‌یه ئەوەیه بڕوامان وا بێت و دان بنێین بەوەدا که تەنها خوای گەوره خاوەنی هەموو ناوو سیفەتێکی بەرزو تەواوەو له هەموو هەڵەو کەم و کوڕی‌یەک دووره وه چەسپاندنی ئەمەش به کردار، ئەمەش بەوه دەبێت که هەر ناوو سیفەتێک خوای گەوره بۆ خۆی دیاری کردووه یان پێغەمبەرﷺ دانی پێدا ناوەو له قورئان و سوننەتی

[10] التوبة/٣١.

[11] الكهف/٢٦.

صحيح‌دا هاتووه بۆ خوا بڕیار بدرێت به‌بێ گۆڕین (التحريف)و له‌کارخستن (التعطيل)و لێ چواندن (التشبيه)و دیاری کردنی چۆنیه‌تی (التكييف) هەروه‌کو خوای گه‌وره ده‌فه‌رموێ: ﴿و لله الأسماء الحسنى فادعوه بها﴾[12].

واته/ هه‌ر بۆ خوایه ناوه جوانه‌کان و ئنجا ئێوه‌ش بپاڕێنه‌وه له خوا به‌ناوه جوانه‌کانی خۆی.

وه هه‌روه‌ها ده‌فه‌رموێت ﴿ليس كمثله شيء وهو السميع البصير﴾[13].

واته/ هیچ که‌س و هیچ شتێک وه‌ک وێنه‌ی خوا ناچێت و له هه‌موو ڕوویه‌که‌وه: زات، ناو، سیفه‌ت.... وه خوای گه‌وره زۆر بیسه‌رو بینه‌ره.

## * هه‌ندێک له سووده‌کانی یه‌کتاپه‌رستی:

١- هه‌رکه‌سێک به ته‌واوی یه‌کتاپه‌رست بێت و پێویستیه‌کانی ئه‌نجام بدات و له هاوبه‌شی بڕیاردان خۆی ڕزگار بکات خوای گه‌وره له ڕۆژی دواییدا ده‌یپارێزێت و سزای نادات هەروه‌کو پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ ده‌فه‌رموێت: ((... وحق العباد على ا لله ان لا يعذب من لا يشرك به شيئاً))[14].

واته/ مافی به‌نده‌کانیش به‌سه‌ر خواوه ئه‌وه‌یه سزای که‌سێک نه‌دات که هاوبه‌شی بۆ بڕیار نه‌دات.

٢- یه‌کتاپه‌رستی مایه‌ی به‌خته‌وه‌ری‌و ئاسوده‌یی‌و دڵ ئارامیه له دنیاو دواڕۆژدا هەروه‌کو خوای گه‌وره ده‌فه‌رموێت: ﴿الذين آمنوا ولم يلبسوا ايمانهم بظلم اولئك لهم الامن وهم مهتدون﴾[15].

واته/ ئه‌و که‌سانه‌ی بڕوایان هێناوه‌و هاوه‌ڵ و هاوبه‌شیان بۆ خوا بڕیار نه‌داوه ئه‌وانه هێمنی‌و ئاسایشیان ده‌ست که‌وتووه‌و وه ڕێنمایی کراون بۆ ڕێگای ڕاست.

---

[12] الأعراف/١٨٠.

[13] الشورى/١١.

[14] رواه البخاري ومسلم.

[15] الأنعام/٨٢.

٣- خوای گەورە پەیمانی داوە بە یەکتاپەرستان کە سەریان بخات و زاڵیان بکات بەسەر دوژمنانیانداو ترس و لەرزیان لەسەر نەهێڵێو لە زەویدا سەقام گیرو جێ نشینیان بکات هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿**وعد الله الذين آمنوا منكم وعملوا الصالحات ليستخلفنهم في الارض كما استخلف الذين من قبلهم وليمكنن لهم دينهم الذي ارتضى لهم وليبدلنهم من بعد خوفهم أمناً يعبدونني لا يشركون بي شيئاً ومن كفر بعد ذلك فاولئك هم الفاسقون**﴾[١٦]. واتە/ خوای گەورە بەڵێنی بەوانەتان داوە کە باوەڕیان هێناوەو کردەوەی چاکیان کردووە کە دەیانکاتە دەسەڵاتداری سەرزەوی وەک چۆن پێشینەکانی ئەوانی کردە دەسەڵاتداری زەوی، وە دینەکەیان بۆ سەردەخات ئەو دینەی کە خوا ڕازی بووە لەسەری بن، وە لەدوای ترس و ناڕەحەتی هێمن و ئاسایش یان پێ دەبەخشێت، دەم پەرستن و هیچ هاوەڵێکم بۆ دانانێن وە هەر کەسێک دوای ئەوە بێ باوەڕ بێ ئەوانە لادەرن لە ڕێی خوای گەروە.

٤- یەکتاپەرستی گەورەترین هۆیە بۆ رزگار بوون لە نەفس و ئارەزوو پەرستیو هەموو جۆرە بەندو باوێکی ناڕاست و نەفامی.

٥- یەکتاپەرستی بنچینەو بناغەیەکی سەرەکیە بۆ یەکبوون و یەک هەڵوێستیو برایەتی.

---

[١٦] النور/٥٤.

# وانەی دووەم:

# هاوبەشی دانان بۆ خوای گەورە

# ((الإشراك بالله))

گەورەترین تاوان بریتی‌یە لە دانانی هاوبەش بۆ خوای گەورە چ لەزاتی خـوادا بێـت یـان لـە ناوو سیفاتەکانیدا بێت یان لە پەرستن و بەندایەتی‌دا بێـت یـان لـە خـاوەنێتی‌و بـەدی هێنـان و بـەڕێوەبردندا بێـت هـەروەکو خـوای گـەورە لەسـەر زمـانی لقمـان پێغەمبـەر (علیـه السـلام) دەفەرموێت: ﴿یا بني لا تشرك با لله ان الشرك لظلم عظیم﴾[17].

واتە/ ئەی کوڕە شیرینەکەم هاوبەش دامەنێ بۆ خوای گەورە چونکە بـێ گومـان هاوبـەش دانان ستەمێکی زۆر گەورەیە.

هەروەها ابن مسعود دەفەرموێت: **سألت النبيﷺ أيّ الذنب أعظم؟** قـال: (**ان تجعـل لله نداً وهو خلقك**)[18].

واتە/ پرسیارم کرد لە پێغەمبەرﷺ کە گەورەترین تاوان چی‌یە؟ فەرمووی ئەوەیە هاوەڵ و هاوبەش بۆ خوا بڕیار بدەیت لەگەڵ ئەوەشدا کە هەر ئەو دروستی کردووی.

هەر بۆیەش خوای گەورە چاوپۆشی لە هاوبەشی دانان ناکات و لە خاوەنەکەی خـۆش نـابێت وەک دەفەرموێت: ﴿**ان ا لله لا یغفر أن یشرك به ویغفر ما دون ذلك لمن یشـاء ومـن یشـرك با لله فقد افترى اثماً عظیماً**﴾[19].

واتە/ بێ گومان خوای گەورە لـەوە خـۆش نـابێت هاوبەشـی بـۆ دابـنرێت بـەڵام جگـە لـە هاوبەشی دانان بۆی، خـۆش دەبێـت لـە هـەموو تـاوانێکی دیکـە بـۆ هـەر کەسـێک کـە خـۆی

---

[17] لقمان/۹۳.

[18] رواه البخاري ومسلم.

[19] النساء/٤٨.

بیەوێت.. وە هەر کەسێک هاوبەش دابنێت بۆ خوای گەورە ئەوە بێ گومـان گـەورەترین تـاوانی کردووە کە بووختانە بەدەم خوای گەورەوە.

## * جۆرەکانی هاوبەشی دانان بۆ خوای گەورە ((انواع الشرك))

### یەکەم/ هاوبەشی دانانی گەورە (الشرك الاكبر):

بریتیـیە لە ئـەنجام دانـی جۆرێـک لـە جۆرەکـانی پەرسـتن بـۆ غـەیری خـوا بەهـەر نیـازو مەبەسـتێکەوە بێـت بـۆ هـەر کەسـێک یـان هـەر شـتێک، چونکـە دامـالینی سـیفەتێکە لــە سیفەتەکانی خوایەتی خواو بەخشینیەتی بە غەیری ئەو، وە دەبێتە مایەی دەرچوونی لە ئیسلام و هەڵوەشاندنەوەی هەموو کارە چاکەکانی. کە ئەمانەش هەندێکن لەم جۆرە هاوبەشی دانانە:

أ- گوێ ڕایەڵی کردنی کەسێک کە حەرام حەڵاڵ بکات و حەڵاڵ حەرام بکـات. کـاتێک کـە عدی کوڕی حاتم هات بۆ لای پێغەمبەرﷺ خاچ (صلیب)ێکی لە ملدا بوو پێغەمبەرﷺ ئەم ئایەتەی بۆ خوێندەوە کە خوا دەفەرموێت: ﴿اتخذوا احبـارهم ورهبـانهم اربابـاً مـن دون الله والمسيح ابن مريم وما امروا الا ليعبدوا الهاً واحداً لا اله الا هو سبحانه عما يشركون﴾[1].

واتە/ گاورەکان زاناو (احبار)و خواپەرست (رهبان)ەکانیان کردبـووە پـەروەردگاری خۆیـان جگە لە خواوە (عیسـی‌ی کوڕی مریەم)یشیان کردبوو بە پەروەردگاری خۆیان وە فـەرمانیان پـێ نەکرابوو تەنها بۆ ئەوە نەبێ کە یەک تاکە خـوا بپەرسـتن کـە (الله)یـەو هیـچ پەرسـتراوێکی بەڕاستی نی‌یە جگە لە خۆی پاک و بێ گـەردو دوورە لـە هـەموو ئـەو شـتانەی کـە دەیانکەنـە هاوبەشی خوا.

((دخل عدي على رسول اللهﷺ وقـال ﷺ وهـو يتلـو هـذه الآيـة ﴿اتخـذوا احبـارهم ورهبانهم ارباباً....﴾ فقال يا رسول الله ما عبدوهم. فقال ﷺ بلى: انهم أحلوا لهـم الحـرام وحرمـوا عليهـم الحـلال فـاتبعوهم، فذلـك عبـادتهم اياهم))[2]. واتـە: (عـدی) گوتـی ئـەی

---

[1] التوبة/٣١.

[2] رواه الترمذي في صحيحه.

پێغەمبەری خوا نەیان دەپەرستن، فەرمووی با حەلاڵیان بۆ حەرام دەکردن حەرامیان بۆ حەلاڵ دەکردن ئەوە پەرستنیان بوو بۆیان.

ب- هاوبەشی دانان لە یاسا (حكم)دا:

كە بریتی‌یە لە بەرەوا زانینی یاسایەك و كار پێ كردنی‌و بەچاكتر زانینی لە یاسای خوای گەورە یان پێی وابێت كە ئیسلام بە كەڵكی چارەسەركردنی كێشەو گیروگرفتەكانی سەردەم نایەت و ڕوو بكاتە دەستورو یاسایەكی تر جا هەرچییەك بێت هەروەكو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ان الحكم الا لله أمر الا تعبدوا الا اياه﴾[22].

واتە/ یاساو بڕیاردان تەنها بۆ خوای گەورەیە كە فەرمانی داوە هیچ شتێك نەپەرستن تەنها خۆی نەبێت.

جـ- خۆش ویستنی كەسێك یان هەر گرووهـ (حزب)و لایەنێك وەك خۆش ویستنی خوا واتە خۆش ویستنێك كە بەگەورە دانان و مل كەچی كردنی تێدا بێت.

هەروەكو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ومن الناس من يتخذ من دون الله انداداً يحبونهم كحب الله والذين آمنوا اشد حباً لله﴾[23].

واتە/ هەندێ لە خەڵكی جگە لە خوا چەند شتێك دەكەن بە هاوتاو هاوبەشی خوا خۆشیان دەوێن وەكو خۆش ویستنی خوا بەڵام باوەڕداران ئەو پەڕی خۆش ویستنیان هەیە بۆ خوای گەورە.

د- پاڕانەوە لە غەیری خوا بۆ داواكردنی رزق و ڕۆزی‌یان چارەسەری نەخۆشی‌و یان بەدی هێنانی ئاوات و رزگار بوون لە ناخۆشی‌و دەردو بەلا... هەروەكو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ولا تدع من دون الله ما لا ينفعك ولا يضرك فان فعلت فانك اذاً من الظالمين﴾[24].

واتە/ جگە لە خوا هاوار مەكەو مەپاڕێوە لە شتێك كە نە سوودو نە زیانت پێ ناگەیەنێت ئنجا ئەگەر تۆ ئەمەت كرد ئەوە بێ گومان دەچیتە ریزی ستەم كاران و هاوبەشی پەیداكەرانەوە.

هـ- بڕوابوون بەوەی كە لەگەڵ خوادا كەسانێك هەن لە: پێغەمبەران و پیاوچاكان و

---

[22] یوسف/٤٠.

[23] البقرة/١٦٥.

[24] یونس/١٠٦.

خۆشەویستانی.خوا... هتد. یارمەتی دەدەن لە بەڕێوەبردنی بوونەوەرداو دەسەڵاتی سوود گەیاندن و زیان گەیاندنیان هەیە. هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿**الا له الخلق والامر**﴾[25].

واتە/ ئاگاداربین کە تەنها دروست کردن و بەدی هێنان و بەڕێوەبردن هەر بۆ خوای گەورەیە.

و- بڕیاردان وئەنجام دانی هەر یەکێک لە: هانابردن (**الاستغاثة**)و ترس و بیم (الخوف) وە لەخۆگرتن (**الخذر**)و تکاو ئارەزووکردن (**الرجاء والرغبة**)و گەڕانەوەو پەشیمان بوونەوە (**الانابة والتوبة**)و سەربڕین و قوربانی کردن (**الذبح والقربان**)و سوڕان و خولانەوە (**الطواف**)و پشت بەستن (**للتوكل**) چەمانەوەو کڕنۆش بردن (الركوع والسجود)و پەنا پێ گرتن (**الاستعاذة**)، بۆغەیری خوا چونکە هەر کەسێک یەکێک لەم شتانەی سەرەوە بۆ غەیری خوا ئەنجام بدات و زلنیاری پێ هەبێت ئەوە بێ گومان گەورەترین هاوبەشی بۆ خوا بڕیار داوە.

## دووەم/ هلوبەشی دانانی بچووک ((الشرك الأصغر)):

بریتی.یە لە هەموو.وتەو کردەوەیەک (القول والفعل) کە مرۆڤ بەرەو هاوبەشی گەورە (الشرك الاكبر) دەبات بێ گومان ئەم جۆرە هاوبەشی دانانەش لە گەورەترین تاوانە گەورەکان دژمێردرێت، بەڵام مرۆڤ پێی کافر نابێت وەک هاوبەشی دانانی گەورە.

- کە ئەمانەش هەندێکن لەو جۆرە هاوبەشی دانانە بۆ خوای گەورە:

أ- رووپامایی (الرياء) کردنێکی کەم یان نەبوونی دڵسۆزی لە پەرستنەکاندا هەروەکو پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت ((**ان اخوف ما اخاف عليكم الشرك الأصغر قالوا وما الشرك الأصغر يا رسول الله؟ قال: الرياء...**))[26].

واتە/ بێ گومان ترسناکترین شتێ کە دەترسم لە سەرتان توشتان بێت هاوبەشی دانانی بچووکە بۆ خوا، وتیان.هاوبەشی دانانی بچووک چی.یە؟ فەرمووی رووپامایی کردنە (الرياء).

ب- سوێند خواردن بە غەیری خوا هەروەکو پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ((**من حلف بغير**

---

[25] الأعراف/٥٤.

[26] رواه احمد باسناد جيد.

**ا لله فقد اشرك))**[٢٧]

واته/ هەر کەسێک سوێند بخوا بە غەیری خوا (ا للە) ئەوا بێ گومان هاوبەشی بۆ خوا داناوە.

ج- هەڵواسینی (ناڵ و مورووە شیمکەو کوژەکە) بۆ چاووزارو لەدەست کردنی دەزوو پەڕۆلە لەمل کردن بەناوی موفەڕکەوە یان هەڵواسینی هەموو جۆرە نوشتەیەک کە بە غەیری قورئان و ناوو سیفاتەکانی خوای گەورەوە بکرێت و هاوارکردن و پاڕانەوەی تێدا بێت لە غەیری خوا. بێ گومان ئەم جۆرە کارانەش هاوبەشی دانانە بۆ خوای گەورە وەک پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت:

**((من علق تميمة فقد اشرك))**[٢٨]

واتە/ هەر کەسێک مووروو یان پارچە پەڕۆ هەڵبواسێت بۆ لابردنی دەردو بەڵاو چاو ئەوە بێ گومان هاوبەشی بڕیار داوە.

یان دەفەرموێت: **((ان الرقى والتمائم والتّولة شرك))**[٢٩]

واتە/ نوشتەو کوژەکەو چەوریو شیرینی کردن هاوەڵ دانانە.

---

[٢٧] صحيح رواه احمد.

[٢٨] رواه احمد.

[٢٩] رواه احمد وابو داود.

# وانەی سێیەم:

# مەرجەکانی لا اله الا الله:

یەکتاپەرستی بنچینەی ئیسلامەو بناغەیەکە بۆ گشت یاساکانی ئیسلام وە هەر لەمەوە ڕەوشتە پاکە ئیسلامیەکان لق و پۆپ دەردەکەن.

زۆر لە فەرموودەکانی پێغەمبەرﷺ ئەوە دەسەلمێنن کە شەهادەتی یەکتاپەرستی تاکە هۆیە کە بۆچوونە ناو بەهەشت و دوور کەوتنەوە لە ئاگری دۆزەخ لە ڕۆژی دواییدا.

بۆ نموومە/ ئەوەتا پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێت: ((**ما من عبد قال لا اله الاّ ا لله ثم مات على ذلك إِلاّ دَخَلَ الجَنَّةَ**))[30].

ئەو هۆیەش نایەتە دی تا هەموو مەرجەکانی ئەنجام نەدرێت و ئەو کۆسپ و تەگەرانەش کە دەبنە هۆی ڕێ گرتن بۆ ئەنجام دانی واتای ووشەی یەکتاپەرستی لانەبرێن.

لە (**حسن البصري**)یان پرسی گوتیان: هەندێ کەس ئەڵێن هەر یەکێک بڵێ: ((**لا اله الاّ ا لله دخل الجنة**)) واتە ئەوا دەچێتە بەهەشت ئایا ڕاستە؟

لە وەڵامدا گوتی هەر کەسێک بڵێت: ((**لا اله الاّ ا لله**)) وە پێداویستیەکانیو ئەرکەکانی بە تەواوی جێ بەجێ بکات دەچێتە بەهەشت●

لە (وهبی کوڕی مَنْبَهْ)یان پرسی گوتیان ((**لا اله الاّ ا لله**)) کلیلی بەهەشتە؟ گوتی بەڵێ..! بەڵام دەبێ ئەوە بزانین کە هەموو کلیلێک ددانی هەیەو دەرگای پێ دەکرێتەوە وە ئەگەر ددانی نەبوو سوودی نابێت و پێی ناکرێتەوە.

کەواتە ددانی کلیلەکەش بریتی‌یە لە مەرجەکانی ((**لا اله الاّ ا لله**)) کە بریتین لە ئەمانەی خوارەوە:

---

[30] رواه الشيخان.

## مه رجی یه كه م/ ( العلــم بمعناهــا نفيــاً واثباتــاً ) شــاره زايی بــه ته واوی مه به سته كه ی له بواری نفي و اثبات:

پێویسته موسڵمان به تەواوی خۆی شارەزا بکات لە واتاو مەبەستی دروشمی یەکتاپەرستی وە لە هەموو بوارێکی ئەم ووشەیەوە، بۆ ئەوەی خـۆی بپـارێزێت لـە تـاوان و گونـاهوو کـرداری ناپەسـەندو حـەرام وسـیفاتی بـێ بـاوەڕیو هاوبەشـی بڕیـاردان و سـیفاتی دوو ڕووەکـان. خـوای گەورەش دەفەرموێت: ﴿فاعلم انه لا اله الاّ ا لله﴾[31].

واتە/ بزانە هیچ کەسێک نی‌یە شیاوی پەرستن بێت تەنها خوای گەورە نەبێت.

## مه رجی دووه م/ (( اليقين المنافي للشك )):

دڵنیایی تەواو لە بـاوەڕداو دوور لـە گومـان: مەبەسـت ئەوەیـە دڵنیـابێت کـە هیـچ ڕچـەو ڕێبازێک نی‌یە بە کـەڵکی پـەیڕەو کـردن و چارەسـەرکردنی گیروگرفتـەکانی ژیـان بێـت تـەنها پرۆگرام و بەرنامەی خوا نەبێت.

خوای گەورەش لەم بارەیەوە دەفەرموێت: ﴿انما المؤمنون الذين آمنوا بـا لله ورسـوله ثـم لم يرتابوا وجاهدوا بأموالهم وأنفسهم في سبيل ا لله اولئك هم الصادقون﴾[32].

واتە/ بەڕاستی بـڕواداران ئەوانـەن کـە باوەڕیـان بـە خـواو پێغەمبەرەکـەی هێنـاوەو هیـچ گومانێکیان نی‌یە لەو بـاوەڕە سـاغەی هەیانـە بـە خـواو پێغەمبـەرﷺ وە شـوێن ڕێبازەکـەی کـەوتوون و دەجـەنگن و تـێ دەکۆشـن بـە سـەروەت و سـامان و لاشـەیانەوە لـە پێنـاوی بـەرز کردنەوەی دروشم و ئاڵای یەکتاپەرستی، بەڕاستی ئەوانە بڕواداری ڕاستەقینەی ڕاست گۆن.

## مه رجی سێهه م/ (( القبول المنافي للرد )):

قایل بوون و ڕازی بوون بەو واتاو دروشمەی کە یەکتاپەرستی دەیگەیـەنێت و مەبەسـتیەتی بەدڵ و بەزمان.

---

[31] محمد/١٩.

[32] الحجرات/د١٥.

بەڵێ موسڵمان دەبێت ئامادە بێ بەدڵ و بەگیان و زمان بۆ بڕیارەکانی خوای پەروەردگار بەبێ هیچ نارەزایی دەربڕینێک نە بەڕووکەش و نە بەدڵیش. بەڵکو دەبێ مل کەچ و گەردن کەچ بێت بۆ فەرمانەکانی خودا بەبێ چەندو چۆن.

خوای گەورەش دەفەرموێت: ﴿**انهم كانوا اذا قيل لهم لا اله الاّ الله يستكبرون ويقولون أئنا لتاركوا آلهتنا لشاعر مجنون**﴾[33]

واتە/ ئەوانە بێ گومان ئەگەر پێیان بگوترایە کە خودا تاک و تەنیایەو هەر ئەو شیاوی پەرستنە ئەوا خۆیان لێ بایی دەبوو لووت بەرز دەبوون جا بەسەر سوڕمانەوە دەیان گوت ئێمە واز لەو هەموو داب و نەریت و خوایانە بهێنین بۆ شاعیرێکی شێت.

## مەرجی چوارەم/ ((الانقياد بحقوقها))/ مل کەچی و گەردن کەچی خۆبەدەستەوە دان و گوێ ڕایەڵی کردنی ئەوەی کە ئەم ووشەیەی ((لا اله الاّ الله)) دەیخوازێت و مەبەستیەتی:

نابێت موسڵمان مل کەچی هیچ ڕچەو ڕێبازو بەرنامەیەکی دەست کردی مرۆڤ بێت، بەڵکو گوێ ڕایەڵ و مل دانەوێنێت بۆ یاساو بڕیارەکانی خوای گەورە بەبێ چەندو چۆن...

خوای پەروەردگارمان دەفەرموێت: ﴿**وأنيبوا الى ربكم وأسلموا له...**﴾[34]

واتە/ بگەڕێنەوە بۆ لای پەروەردگارتان، پەشیمان بنەوە لە گوناهو تاوانەکانتان. وە مل کەچ و گوێ ڕایەڵی بڕیارو فەرمانەکانی خوا بن بەپاک و خاوێنی.

هەروەها دەفەرموێت: ((**ومن احسن ديناً ممن أسلم وجهه لله وهو محسن**))[35]

واتە/ کێ لەو کەسە بەڕێزترو شیاوترو بڕواداری ڕاستەقینە ترە؟ کە لەژێر فەرمان و گوێ ڕایەڵی خوادا دەجولێتەوەو مل کەچێتی وچاکە خوازیشە.

وە هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿**ومن يسلم وجهه الى الله وهو محسن فقد**

---

[33] الصافات/ ٣٥-٣٦

[34] الزمر

[35] الأنبياء/ ١٢٥

استمسك بالعروة ألوثقى﴾[٣٦].

واتە/ هەر کەس مل کەچ و کڕنۆش بەربێت بۆ فەرمانەکانی خودا وە چاکە خوازیش بێت ئەوە بەڕاستی دەستی گرتووە بە ڕچەو پرۆگرامی خوداوە کە بەهێزو نەپچڕاوە.

وە هەروەها لە شوێنێکی تردا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ولا تتبع الهوى فيضلك عن سبيل الله﴾[٣٧]

واتە/ ئەی پێغەمبەرﷺ نەکەی شوێن ئارەزوو بۆچوونی خۆت و ڕێبازی تر بکەویت چونکە ئەم کارە گومڕات دەکات لەسەر ڕاستە شەقامی پرۆگرامی خوای داناو پەروەردگار.

## مەرجی پێنجەم/ ((الصدق المنافي للكذب))/ ڕاست گۆیی و دژایەتی کردنی هەموو درۆیەک:

بڕوا هەر ئەوە نی‌یە بە زمان بگوترێت بەڵکو دەبێت ڕاستەوخۆ لە ناخی دڵەوە هەڵبقوڵێت و بچەسپێنرێت وە بنەخشێنرێت بە کارو کردەوە.

وە هەموو کەسێک بەو ئاسانی‌یە خوا باوەڕی لێ وەرناگرێت بەڵکو بە هەموو جۆرێک تاقی دەکاتەوە بەپێی بەرزو نزمی باوەڕەکەی... بۆ ئەوەی بیسەلمێنێت کە مەرج نی‌یە بەس بە زمان بگوترێت من بڕوادارم.

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿الم. أحسب الناس أن يتركوا أن يقولوا آمنا وهم لا يفتنون ولقد فتنا الذين من قبلهم فليعلمن الله الذين صدقوا وليعلمن الكاذبين﴾[٣٨]

واتە/ ئایا!؟ ئەوانە وا هەست دەکەن و گومان دەبەن کە وازیان لێ بهێنرێت کە وای دادەنێن باوەڕیان هەبێ‌و تاقی ناکرێنەوە، نەخێر، بەڕاستی گەلێکمان لەو کۆڕو کۆمەڵ و گەلانەی کە ڕابورد تاقی کردەوە بە هەموو شێوەیەک، بۆ ئەوەی پەروەردگارت بڕواداری ڕاستەقینەو چاکە خوازو خۆگرو ڕاست گۆ جیا بکاتەوە لە وانەی کە دووڕوو درۆزنن لەو باوەڕەی کە هێناویانە کە تەنها بۆ بەرژەوەندی‌و مەبەست و نیازێکی دنیایی‌یە.

---

[٣٦] لقمان/٢٢

[٣٧] ص/٢٦

[٣٨] العنكبوت/١-٢-٣

﴿ومن الناس من يقول آمنا با لله وباليوم الآخر وما هم بمؤمنين* يخادعون ا لله والذين آمنوا وما يخدعون الاّ أنفسهم وما يشعرون* في قلوبهم مرض فزادهم ا لله مرضاً ولهم عذاب اليم بما كانوا يكذبون*﴾[٣٩]

واته/ هەندێ کەس هەن دەڵێن باوەڕمان بە خواو بە ڕۆژی دوایی‌و زیندووبونەوە هەیە. نەخێر ئەوانە بڕواداری ڕاستەقینە نین بەڵکو ئەمە تەنها بە زمان دەیڵێن بەبێ چەسپاندنی لە دڵ و کرداری پێ کردنی، ئەوانە وا هەست دەکەن بە بۆچون و تێڕوانینی خۆیان کە خوداش و ئەوانەش کە بڕوادارن هەڵدەخەڵەتێنن. جا بێ گومانیشە کە بەم ڕەوشتە فرو فێڵاویەیان ناتوانن هەڵیان بخەڵەتێنن بەڵکو ئەوانە خۆشیان و دەرونیشیان هەڵخەڵەتێنراون و هەستیشی پێ ناکەن دڵەکانیان پڕە لە نەخۆشی‌و دوو دڵی‌و گومان و درۆزنی خوداش ئەوەندەی دیکە نەخۆشی دەروونی‌و دوو دڵی‌و ناوەکی‌و گومڕایی بۆ زیاد کردوون، ئەوانە سزاو ئازارێکی توندو تیژیان بۆ هەیەو ئامادە کراوە بەرامبەر بەو پڕو پاگەندەو درۆزنی‌یەی کە دەیان کرد.

وە هەروەها پێغەمبەری خواش ﷺ دەفەرموێت: ((ما من أحد يشهد أن لا الـه الاّ ا لله وأن محمداً رسول ا لله صدقاً من قلبه الاّ حرّم ا لله عليه النار))[٤٠].

واته/ هەرکەسێک شاهێدی بدات کە خودا تاک و تەنهایەو پێغەمبەریش بەندەو نێردراوی خوایە وە بەو شێوەیە بڕیار بدات بەڕاست گۆیی‌و ڕاستەقینەیی‌و تەواوەتی‌و کەنارگیربێت لە هەموو درۆیەک ئەوە خودا دۆزەخی لێ یاساغ دەکات.

## مه رجی شه شه م/ ((الاخلاص المنافي للشرك)):

خوا پێ مەبەست بوون لە ئیش و کارەکانماندا بۆ خودای گەورە:

دەبێت هەر کاروکردەوەو ڕەفتارو قسەو خوا پەرستی‌یەکمان تەنها بۆ مەبەستی ڕەزامەندی خوای گەورەبێت، وە هیچ مەبەستێکی دنیاییمان نەبێت کە چنگمان کەوێت.. وە دەبێت هەوڵی پاک و خاوێن کردنەوەی کارو کردەوەکانمان بدەین، کە ئەمەش پابەندە بە نییەت و نیازی چاکەوە کە دوور بێت لە هەموو خلتەو بەرچاوی‌یەک و ڕووپامایی‌یەک وە کەنارگیربوون لە

---

٣٩ البقرة/٨-٩

ه الشيخان.

بەشداربوونی هاوبەشێتی لە کارەکانماندا وە مەبەست و ویست تەنها خوای گەورە پێی ناگادارە بگرە فریشتەکانی شانی ڕاست.و چەپیش بێ ناگان لە نیەتی دڵ.. وە تەنها کردارە رووکەشیەکان تۆمار دەکەن. خوای گەورەش دەفەرموێت: ﴿**وما أمروا الاّ ليعبدوا الله مخلصين له الدين حنفاء**﴾[41]

واتە/ هیچ فەرمانێکیان پێ نەکراوە مەگەر ئەوە نەبێت کە خودا بە تاک و تەنها بپەرستن و هەموو کارو کردەوەیەکیان بە دڵسۆزیو پاکیەتی بنوێنن بۆ خودا. وە کەنارگیر بن لە هەموو هاوبەشی بڕیاردانێک بۆی.

## مەرجی حەوتەم: ((المحبة))/ ئەوپەڕی خۆشەویستی نواندن بۆ خوداو پێغەمبەری خودا ﷺ پاشان بۆ کۆمەڵانی موسڵمانان:

دەبێت موسڵمان کەنارگیر بێت و خۆی دوور بخاتەوە لە هەموو خۆشەویستی‌یەک بەرامبەر هەموو ((بەرنامەو ڕێبازو پرۆگرام و یاساو دەستوورو بڕیارو فەرمان ڕەوایەتی))یەکی هەموو پارت وستەم کارێک کە دژی بەرنامەو بڕیارەکانی خودان...!! کەواتە هەموو خۆشەویستی‌یەک دەبێت بگەڕێتەوە بۆ خواو پێغەمبەرو فەرمانەکانی.

پاشان ئەو خۆشەویستیانەش کە خوارسکێن نابێت ببنە هۆی کەم کردنەوەی خۆشەویستیت بەرامبەر بە خوای گەورە.

وە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿**والذين آمنوا أشد حباً لله**﴾[42]

واتە/ ئەوانەی باوەڕی ڕاستەقینەیان هێناوە ئەوپەڕی خۆشەویستیان هەیە بۆ خوا.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿**قل ان كنتم تحبون الله فاتبعوني يحببكم الله ويغفر لكم ذنوبكم**﴾[43].

واتە/ ئەی پێغەمبەر ﷺ پێیان ڕابگەیەنەو بڵێ ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن و خواو بەرنامەی خواتان خۆش دەوێ دەی ئێوە شوێنم بکەون بۆ ئەوەی خوا خۆشتانی بوێت و پشت گیریتان لێ

---

[41] البينة/٥

[42] البقرة/١٦٥

[43] آل عمران/٣١.

بكات وه خۆشەویستی‌یەکەتان ببێتە هۆی لێ خۆش بوون لە گوناهو تاوانەکانتان.

پێغەمبەری خواش ﷺ دەفەرموێت: ((**ثلاث من كن فيه وجد بهن حلاوة الايمان... أن يكون الله ورسوله أحبّ اليه مما سواهما، وأن يحب المرء لا يحبه الاّ لله، ويكره أن يعود في الكفر بعد أن أنقذه الله منه كما يكره أن يقذف في النار**))[٤٤].

واتە/ هەر کەسێك سێ شتی لە خۆیدا بەدی هێنا ئەوا خۆشەویستیو شیرینی باوەڕ دەچێژیت کە بریتین لە:

١- خواو پێغەمبەری خوای گەورەی لە هەموو شتێك لەلا خۆشەویستتر بێت.

٢- خۆشەویستیت بۆ هەر کەسێکی بڕوادار هەبێت لەبەر خاتری خوا بێت.

٣- چەندی پێ ناخۆشە کە بخرێتە دۆزەخەوە، هەر بەو شێوەیەش پێی ناخۆش بێت کە بگەڕێتەوە ناو کۆڕو کۆمەڵی بێ باوەڕی کاتێك کە خوا ڕێنمایی داو ڕزگاری کردووە لێی.

---

رواه البخاري.

# وانەی چوارەم:

# هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلام یان شایەتمان (١)

ئەو کارانەی کە هۆن بۆ هەڵوەشاندنەوەی ((لا اله الاّ ا لله)) لە هەمان کاتدا کاریگەرن بۆ هەڵوەشاندنەوەی یەکتاپەرستی پەروەردگاری ((**توحید الربوبیة**))و یەکتاپەرستی خوایی ((**توحید الالوهیة**))و یەکتاپەرستی ناوو سیفاتەکانی خوای گەورە (جل جلالە) ((**التوحید في الاسماء والصفات**)).

زانایانی پێشوو (خوایان لێ ڕازی بێت) ئەم کارانەیان بۆ ئێمە ڕوون کردۆتەوەو ئێمەیان ئاگادار کردۆتەوە بۆ ئەوەی نەکەوینە ناو ئەم گێژاوەو تووشی سەر لێشێواویو گومڕایی نەبین لێرەدا زانایان حوکمی دەرچوون لە ئیسلامیان ((**حکم المرتد**)) لەسەر ئەو کەسانە داوە کە دەکەونە ناو ئەو هەڵانەوە کە مرۆڤ لە ئیسلام دەردەکات بۆیە زانایان دەڵێن (١) کار هەن مرۆڤ لە ئیسلامەتی دەردەکەن. ئەم کارانەش ئەمانەی خوارەوەن:

## ١) هاوەڵ و هاوبەشی پەیدا کردن بۆ خوای پەروەردگار ((الشرك بالله)):

هەر کەسێک هاوبەش بڕیار بدات بۆ خوا لەهەر شتێکدا کە تایبەتی خوا بێت لە بەندایەتیو غەیری بەندایەتی ئەوە بێ گومان هاوبەش پەیدا کەر (مشرک)و بێ باوەڕ (کافر)ە بەڵام گەورەترین هاوبەش بڕیاردان بۆ خوا بەندایەتی کردنە بۆ غەیری خوا یا لەگەڵ خوادا، یان هاوبەش بڕیار بدات بۆ خوا لە کاردا کە پێی وا بێت جگە لەخوا کاری بەدەستە.

خوای گەورەش دەفەرموێت: ﴿**انه من یشرك با لله فقد حرم ا لله علیه الجنة ومأواه النار**

**وما للظالمين من انصار﴾**[٤٥]

واته/ هەرکەسێک هاوەڵ بۆ خوای تاک و تەنها پەیدا بکات بەهەشتی لێ حەرام دەبێت و دەچێتە دۆزەخەوە. هیچ هێزێکیش نییە بەهانای بێت و رزگاری بکات.

- لەو شتانەی کە بەهاوەڵ ((الشرک)) پەیدا کردن دادەنرێن:

* پاڕانەوەو هانا بردنە بەر غەیری خوای پەروەردگار.

* داوای فریاکەوتن لە مردوو گۆڕەکانیان.

* نەزر کردن و سەربڕین بۆ غەیری خوا.

* ترسان لە هێزی غەیبی غەیری خوا، و.... هتد.

خوا ئەفەرموێت: **﴿ان الله لا يغفر أن يشرك به ويغفر ما دون ذلك لمن يشاء﴾**[٤٦].

واته/ خوای ((جل جلاله)) بەهیچ کلۆجێک لەو موشریکانە خۆش نابێت کە هاوەڵیان بۆ خوا پەیدا کردووە تا مردن تۆبەیان نەکردووە. وە خوای گەورە لەهەر گوناهێکی تر خۆش دەبێت لە بەندەکانی بە پێی ویست و ئیرادەی خۆی تەنها لە شرک نەبێت.

## ٢) من جعل بينه وبين الله تعالى وسائط يدعوهم او يستغيث بهم، فقد كفر أو أشرك:

هەر کەسێک لەنێوان خۆیو خوادا هۆ دابنێو داوای شەفاعەتی لێ بکات و پشتی پێ ببەستێو وا تێ بگات ئەو هۆ (**وسيلة**)یە پێی دەکرێ خوای لێ ڕازی بکات، ئەوە کافرەو لە ئیسلام دەرچووە بە گوفتاری هەموو زانایانی ئیسلام.

خوای گەورە دەفەرموێت: **﴿واذا سألك عبادي عني فاني قريب أجيب دعوة الداعي اذا دعاني﴾**[٤٧].

واته/ ئەی پێغەمبەرﷺ ئەگەر بەندەکانم هەواڵی منیان پرسی لێت ئەوا بێ گومان من نزیکم و بەدەنگ ئەو کەسانەوە دێم کەوا تەنها داوا لە من دەکەن.

---

[٤٥] المائدة/٧٢

[٤٦] النساء/٤٨

[٤٧] البقرة/١٨٦

## ٣) عدم تكفير المشركين أو تصديقهم: بەكافر دانەنانی موشریكان یان بە ڕاست زانینیان:-

هەر كەسێك كافرو موشریكی پێ كافر نەبێت و ڕێبازو باوەڕیانی پێ دروست بێت و بۆیان ڕاست بكاتەوە ئەمەش كوفرەو لە ئیسلام دەرچوونە. خوای گەورە دەفەرموێت: ((قد كانت لكم أسوة حسنة في ابراهيم والذين معه اذ قالوا لقومهم انا براء منكم ومما تعبدون من دون الله كفرنا بكم وبدا بيننا وبينكم العداوة والبغضاء ابداً حتى تؤمنوا با لله وحده))[٤٨]

واتە/ بێ گومان سەرمەشقی جوان هەیە بۆتان لە ئیبراهیم و هاوەڵەكانیدا كاتێك بە گەلەكەیان گوت بێ گومان ئێمە بەرین لە ئێوەو لەو شتانەی كە دەیان پەرستن جگە لەخوا، بڕوامان نەما پێتان وە بەرپابوو لەنێوان ئێمەو ئێوەدا دوژمنایەتیو ڕق و كینە هەتا هەتایە. مەگەر بڕوا بێنن بەخوای تاك و تەنها.

كەواتە/ هەموو كات هەڵوێستی ئێمە لەگەڵ بێ باوەڕان و هاوبەشی پەیدا كەران بریتییە لە دوژمنایەتی ((المعاداة)) نەك دۆستایەنی ((الموالاة))و یارمەتی دان، مەگەر خوای گەورە بە تاقە خواو پەرستراو بزانن و هیچ هاوبەشێكی بۆ بڕیار نەدەن، ئەو كاتە هەڵوێستمان لە دوژمنایەتییەوە –البراء او المعاداة– دەگۆڕێت بۆ دۆستایەتیو خۆش ویستن –الولاء والمحبة– چونكە ئەو كاتە دەبینە برا لەسەر ئەساس و بنچینەی بڕوا ﴿انما المؤمنون اخوة﴾[٤٩].

## ٤) الاعتقاد باكتمال غير الاسلام أو قبول حكم غيره:

بە تێرو تەواو زانینی بەرنامەیەك جگە لە ئیسلام یا وەرگرتنی حوكمی غەیری خوا:

هەر كەسێك تیۆرو دەستوورو ڕێبازە دروست كراوەكانی دەست كردی مرۆڤی پێ ڕاست بێت و بەباشتری بزانێت لە دەستوورو ڕێبازی ئیسلام. یان وەها تێ بگات ئیسلام بە كەڵكی چەرخی ئێستا نایەت یان وا بزانێ ئیسلام هۆی دواكەوتن و نەزانییە هەروەها وا تێ بگات ئیسلام ئایینێكە تەنها پەیوەندی بە خواوە هەیەو دوورە لە كاروباری مرۆڤ و ژیان. یان بڵێت

---

[٤٨] الممتحنة/٤.

[٤٩] الحجرات/١١

دەست بڕینی دزو ڕەجم کردنــی زیناکـار شتێکی ناشـرینەو لەگـەڵ زەمانـەدا نـاگونجێ وەیـان باوەڕی وا بێت هیچ شتێک ڕێگای ناگرێ حکم بکات بەهەر دەستوورو ڕێبازێکی تـری دروسـت کـراو لـە لایـەن مرۆڤـەوە، ئـەم کەسـانەش لـە سـنووری ئیسـلام دەرچـوون و پـەیوەندییان بـە ئیسلامەتی نەماوە بەڕای هەموو زانایـانی ئیسـلام خـوای گـەورەش دەفـەرموێت: ﴿الم تـر الى الذين يزعمون انهم آمنوا بما أنـزل اليـك ومـا أنـزل مـن قبلـك يريـدون أن يتحـاكموا الى الطاغوت وقد أمروا أن يكفروا به ويريد الشيطان أن يضلهم ضلالاً بعيداً﴾[٥٠]

واتە/ ئایا سەیری ئەو کەسانە ناکەی کەوا گومـان دەبـەن کـە بڕوایـان هێنـاوە بـەوەی کـە ناردراوەتە لای تۆ -کە قورئانە- وە ئەوەش کە لەپێش قورئـاندا نـاردراوە، دەیانـەوێت کێشـەو بەرەی خۆیان بەرنە لای **طاغوتان**، لەگەڵ ئەوەشدا فەرمانیان پـێ کـراوە کـە بـێ بـاوەڕ بـن بـە **طاغوتان** وە شەیتانیش دەیەوێت کە گومڕایان بکات بـە گومـڕا کردنێکـی وا کـە زۆر دووریـان بخاتەوە لە ڕێی ڕاست.

## ٥) من أبغض شيئاً مما جاء به النبيﷺ فقد كفر ولو عمل به ظاهراً:

هەر کەسێک ڕق و قینی هەبێت بەرامبەر بە فەرمانێک لە فەرمانەکانی خوای گـەورە یـان ئـەو شتانەی کـە پێغەمبـەری خـواﷺ هێناویـەتی ئـەوە بـێ گومـان کوفـرە بـا هــەر چـەند بەڕواڵەتیش کاری پێ بکات.

ئەو دووڕوویی -نفاق-ە بیرو باوەڕی (**الاعتقادي**)یەی کە خاوەنەکەی پێ کافر دەبێت شەش جۆرن:

١- بە درۆ خستنەوەی پێغەمبەرﷺ.

٢- بە درۆ زانینی هەندێک لەو شتانەی کە پێغەمبەرﷺ هێناویەتی.

٣- ڕق لێ بوونەوە لە پێغەمبەری ئازیزو خۆشەویستﷺ.

٤- دڵخۆش بوون بە لاواز بوونی دینی پێغەمبەرﷺ.

٥- ڕق بوون لە هەندێ لەو شتانەی کە پێغەمبەرﷺ هێناویەتی.

---

[٥٠] النساء/ ٦٠

٦- ڕق بوون و دڵ ناڕەحەت بوون و پێ ناخۆش بوون بە سەرکەوتنی دینی پێغەمبەرﷺ.

ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ذلك بـأنهم اتبعوا ما أسـخط الله وكرهـوا رضوانـه فأحبط أعمالهم﴾[41]

واتە/ ئەوانە ئەو کافرو تاوانبارانە بە ئاروزووی خۆیان بەدوای ڕێگای لادەرێکـی ئیسـلامی پیرۆز کەوتوون لە نیفاق و گوناهکاریو خیانەت و خۆفرۆشی بۆ دوژمنانی خـوای گـەورە ((جـل جلاله))وە هۆگـری ڕێبـازی کوفـر بـوون. ڕق و قینیـان هـەبوو بەرامبـەر بـە ڕەزامـەندی خـوای باڵادەست و ناڕازی بوون بە ڕێگـای قورئـانی پـیرۆز وە بـە پێچەوانـەی ئەمـەش هـەموو هـێزو توانای خۆیان بەکارهێنا بۆ دژایەتی خوای گەورە. وە ئەو کـارو کردەوانـەی کـە شـانازیان پێـوە دەکرد وەلای خۆیان بە گرنگیان دەزانی هەموویان لێ پـووچ دەبێتـەوەو ڕیسـوا دەبـن لـە ڕۆژی دواییدا.

---

[41] محمد/٢٨

# وانەی پێنجەم:

# هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلام یان شایەتمان (٢)

**٦) الاستهزاء بشيء من دين الله: گاڵتە کردن بە شتێک لە دینی خوای گەورە:**

هەر کەسێک گاڵتە بە رێبازی ئیسلام بکات وەیان گاڵتە بە سزادان و پاداشتی رۆژی دوایی بکات لە ئیسلام دەردەچێت.

خوا دەفەرموێت: ﴿**قل أبا لله وآياته ورسوله كنتم تستهزؤن، لا تعتذروا قد كفرتم بعد ايمانكم**﴾[٥٢]

واتە/ ئەی محمدﷺ تۆ بڵێ پێیان: ئایا بەخواو بە ئایەتەکانی خواو بە پێغەمبەرەکەی گاڵتە دەکەن، بڕوبیانوو مەهێننەوە بێ باوەڕ بوون دوای ئەوەی بڕواتان هەبوو.

**٧) ممارسة أنواع السحر:**

واتە/ خۆ خەریک کردن و هەوڵ دان بۆ هەر جۆرێک لە جۆرەکانی سیحرو جادوو.

هەر کەسێک بڕوای بە سیحرو جادووگەری هەبێت و خۆی ماندوو بکات و هەوڵ و تەقەلای بۆ بدات بێ گومان ئەم کارەی دەبێتە هۆی هەڵتەکاندن و هەڵوەشاندنەوەی ئیمان و باوەڕەکەی هەروەکو پێغەمبەری خواشﷺ فەرمانمان پێ دەکات بە خۆ پاراستن و خۆ دوور گرتن لە جادوو کە دەفەرموێت: ((**اجتنبوا السبع الموبقات، قالوا يا رسول ا لله وما هن؟ قال: الشرك**

[٥٢] التوبة/٦٥-٦٦

با لله والسحر وقتل النفس التي حرم ا لله الا بالحق...))[٥٣]

واته/ خۆتان له حەوت شته لەناو بەرەکان بپارێزن گوتیان ئەی پێغەمبەری خوا ئەوانە چین؟ فەرمووی: هاوەڵ دانان بۆ خوا، سیحر، کوشتنی ئەو نەفسەی کە خوا حەرامی کردووە بە حەق نەبێ.

تێبینی:- لای هەندێ زانایان وایە کە جادوو شایەتمان دەهەڵناوەشێنێتەوە.

## ٨) مظاهرة المشركين ومعاونتهم على المسلمين:

واتە/ پشتگیری کردنی -هاوبەش بڕیار دەرەکان- مشرکێ-و یارمەتی دانیان دژی موسڵمانان کە ئەمەش یەکێکە لەو شتانەی ئیمان هەڵدەوەشێننەوەو لە ئەنجام دا مرۆڤ کافر دەکات. لەبەر ئەوەی پشتگیری کردن و یارمەتی دانیان بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەمە دۆستایەتی‌یە -ولاء- بۆ ئەوان و پشت هەڵکردن و بەری بوونە -براء- لە موسڵمانان هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ومن يتولهم منكم فانه منهم إن ا لله لا يهدي القوم الظالمين﴾[٥٤]

واتە/ هەر کەسێک بێ باوەڕان و جولەکەو گاوران بکاتە دۆستی خۆی ئەوە بێ گومان ئەویش هەر لەوانە، بێ گومان خوای گەورە ڕێنمایی گەلی ستەم کار ناکات.

## ٩) الاعتقاد في إمكان الخروج عن الشريعة:

واتە، بڕوابوون بە گونجانی دەرچوون لە یاسای ئیسلام:

هەر کەسێک بڕوای وا بێت کە دروستە بۆ هەندێک لە خەڵکی کە لە دین دەربچن یان بیرو باوەڕی وابێت کەسانێک هەن دەگەنە پلەو پایەیەک کە خوا پەرستنیان لەسەر نامێنێ بەڕای خۆیان چونکە گەیشتوونەتە بەرزترین پلەی ئیمان، ئەوە بێ گومان ئەو کەسە لە ئیمان و ئایینی ئیسلام دەردەچێت و بێ باوەڕ دەبێت.

هەر وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ومن يبتغ غير الاسلام ديناً فلن يقبل منه وهو في

---

[٥٣] من حديث ابي هريرة في الصحيحين وغيرهما.

[٥٤] المائدة/٥١.

الآخرة من الخاسرين﴾[٥٥]

واتە/ هەر کەسێک جگە لە ئیسلام ڕێبازێکی تر بکاتە ئاینی خۆی بێ گومان لێی وەرناگیرێو لە دواڕۆژدا لە ڕیزو تاقمی دۆڕاوو زەرەرمەندو زیان لێ کەوتوانە.

وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿ان الدين عند ا لله الاسلام﴾[٥٦]

واتە/ بێ گومان دین لە لای خوای گەورە تەنها ئیسلامە.

## ١٠) الاعراض عن دين الله:

واتە/ پشت هەڵکردن لە ئیسلام و بەرهەڵستی کردنی: هەر کەسێک بەرهەڵستی ئیسلام بکات و بێزاری دەربڕێ، یان بە تەواوی ئیسلامی نەوێت و کاری پێ نەکات ئەوە بەم کردەوەی بێ باوەڕو کافر دەبێت.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ومن أظلم ممن ذكر بآيات ربه ثم أعرض عنها انا من المجرمين منتقمون﴾[٥٧]

واتە/ زاڵمترین و ستەمکارترین کەسانێک ئەوانەن کە ئایاتی خوای گەورەیان بۆ ڕوون دەکرێتەوە پاشان پشتی تێ دەکەن و ڕووی لێ وەردەگێڕن و لە یادی خۆیانی دەبەنەوە هەروەک لە پێشەوە گوێیان لێ نەبوو بێت. خوا تۆڵەیان لێ دەستێنێتەوە بەهۆی ئەم کارەیان.

* لێرەدا هیچ جیاوازییەک بەدی ناکرێت لەنێوان ئەو کەسانەی بە گاڵتە بەرهەڵستی ئیسلام دەکەن و ئەوانەی بەڕاستی ((جدّي)) وە ئەوانەی لەترسی خەڵک ئەم کارە دەکەن، تەنها ئەو کەسانە نەبێت کە لە دڵەوە نارازین و پێیان خۆش نییە بەرهەڵستی ئیسلام بکەن بەڵام لە ترسی کوشتن بە زۆرەملێ چەند شتێک دەڵێن.

﴿الاّ من أكره وقلبه مطمئن بالايمان﴾[٥٨]

واتە/ تەنها ئەو کەسانە نەبێت کە دڵنیان لە ئیمانەکەیان بەڵام بە زۆرەملێ کوفریان پێ دەکەن.

---

[٥٥] آل عمران/٨٥.

[٥٦] آل عمران/١٩

[٥٧] السجدة/٢٢

[٥٨] النحل/١٠٦

# وانەی شەشەم:

# الكفر ((بێ باوەڕی))

کوفر دوو جۆرە کوفری گەورەو کوفری بچووک:

١) **کوفری گەورە:** ئەم جۆرە کوفرو بێ باوەڕییە خاوەنەکەی لە ئیسلام دەردەکات و تەواو بێ باوەڕ دەبێت کە چەند جۆرێکی هەیە:

أ- کوفری باوەڕو عەقیدەیی ((**اعتقادي**))

ب- کوفری کرداری ((**العملي**))

جـ- کوفری گوفتاری ((**قولي**))

**أ) کوفری باوەڕی ((اعتقادي))** جۆرو هۆکانی زۆرن کە ئەمانە هەندێکیانن:

١- کوفری بە درۆزانین ((**التكذيب**)):

واتە بە درۆزانینی قورئان یان فورمودەکانی پێغەمبەرﷺ یان هەر بەشێک لە قورئان و فەرموودەکان بەڵگەش:

**((ومن أظلم ممن افترى على الله كذباً أو كذب بالحق لما جاءه* أليس في جهنم مثوى للكافرين))**[59]

واتە: کێ لەو کەسە ستەمکارترە کە درۆ بەسەر خواوە هەڵبەستییان کاتێک نایەتە ڕاستەکانی خوای بۆ هات بە درۆیان بزانێ؟! مەگەر دۆزەخ جێگای ئەو بێ باوەڕانە نییە؟

یان ﴿**أفتؤمنون ببعض الكتاب وتكفرون ببعض**﴾[60]

واتە:- ئایا باوەڕ دێنن بە هەندێک لە پەڕاوی خوداو بێ باوەڕو دەبێ بە هەندێکی دیکەی.

---

[59] العنكبوت/٦٨

[60] البقرة/٨٥.

٢- كوفری پشت لێ هەڵكردن و لووت بەرزی ((الاباء والاستكبار))

لەگەڵ دان پێدانــان و بەڕاســت زانینــی حــەق و ڕاســتی بــەڵام ملــی بــۆ كــەچ ناكــات وەكــو سەركەشیو بێ باوەڕ بوونی شەیتان (إبلیس).

بەڵگەش هەروەكو خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿**واذ قلنا للملائكة اسجدوا لآدم فسجدوا الاّ ابليس أبى واستكبر وكان من الكافرين**﴾[61]

واتە: كاتێ كە فەرمانمان دا بە فریشتەكان كە كڕنوشی ڕێز بەرن بــۆ ئــادەم، دەســت بــەجێ كڕنوشیان بۆ برد تەنها شەیتان نەبێت لوت بەرزی نواندو پشــتی لــە فەرمانەكــە هــەڵكرد هــەر بەهۆی ئەوەوە بوو چووە ریزی بێ باوەڕانەوە.

٣- كوفری ڕاڕاییو گومان بوون ((الظن والشــك)) بەرامبــەر بــە خــواو پێغەمبــەران و ڕۆژی دواییيان باوەڕ نەبوون پێیان و بەڕاست نەزانینیان.

بەڵگەش: ﴿**وما أظن الساعة قائمة....... أكفرت بالذي خلقك من تراب**﴾[62]

واتە: گوتی (خاوەنی باخەكە) گومانم وایە قیامەت نەیەت... (هاوەڵەكەی پێی گوت: ئایا بێ باوەڕ بووی بەوەی كە دروستی كردووی لە گڵ؟

بۆ نموونە/ باوەڕی بە بەهەشت و دۆزەخ یان پاداشت و سزا نەبێت.

٤- كوفری سەرپێچی كردن ((الاعراض)):

بریتیيە لە وەڵام نەدانــەوەی داواكارییــەكانی ئــاینی پــیرۆزی ئیســلام و واز لــێ هێنانیــان. بەڵگەش: ﴿**والذين كفروا عما أنذروا معرضون**﴾[63]

واتە/ ئەوانەی كە بێ باوەڕ بوون بەوەی كە ئاگادارمان كردوونەتەوە لێی سەرپێچییان لــێ كرد. بۆ نموونە/ نوێژ یان زەكات دان بە پێویست و واجب نەزانن لەسەر خۆیان.

## ٢) كوفری كرداری ((الكفر الفعلي)):

نموونەی ئەم جۆرە بێ باوەڕییەش وەكو:

---

[61] البقرة/٣٤.

[62] الكهف/٣٦-٣٧

[63] الأحقاف/٣

١- کڕنوش بردن بۆ غەیری خوا.

٢- فڕێ دانی قورئانی پیرۆز بۆ ناو پیسایی.

٣- سووڕانەوە ((**طواف**)) بە دەوری گۆڕی ئەولیاو پیاو چاکاندا.

## ٣) کوفری گوفتاری ((الكفر القولي))

نموونەی ئەم جۆرەش وەکو:

١- جنێودان بە پەروەردگار یان بە یەکێك لە پێغەمبەران سەلامی خوایان لێ بێت، یان بەئاینی پیرۆزی ئیسلام.

٢- هاناو لاڵانەوە بۆ ئەولیاو پیاوچاکان لە کاتی نارەحەتیو چەرمەسەریدا.

٣- گاڵتە کردن و سوکایەتی بە قورئانی پیرۆز یان بە ئایەتێکی قورئان یان پێغەمبەران یان بە ناوێك لە ناوەکانی خوای گەورە یان بە بەهەشت و دۆزەخ یان بە هەڕەشەو بەڵێنەکانی خوای گەورە...

## ٢) کوفری بچوك ((الكفر الأصغر)):

ئەم جۆرە کوفرە بریتییە لەو جۆرە گوناهو تاوانانەی کە پەروەردگار ناوی کوفری لێناون و لەگەڵ مانەوەی ناوی باوەڕ (ایمان) بە خاوەنی گوناهەکەو، وە نابێتە هۆی دەرچوونی لە بازنەی ئیسلام.

بۆ نموونە/ ا ) کوفری نازو نیعمەت بەڵگەش ئەوەیە کاتێ خوای گەورە گوفتار لەگەڵ باوەڕدارانی گەلی موسا دەکات و دەفەرموێت: ﴿**واذ تأذن ربكم لئن شكرتم لأزيدنكم ولئن كفرتم ان عذابي لشديد**﴾[٦٤]

واتە/ پەروەردگارەکەتان بانگەوازی کرد ئەگەر شوکرانە بژێربن نیعمەتی زیاترتان دەدەمێ، وە ئەگەر بێ باوەڕ بن سزای من زۆر سەختە.

ب) کردنی هەندێ گوناهی گەورەو لەگەڵ ئەوەشدا مرۆڤی پێ لەدین دەرناچێت و هەر

---

[٦٤] ابراهيم/٧

ئیمان داری پیّ دەگوترێت.

وەکو/ پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((**سباب المسلم فسوق وقتاله كفر**))[٦٥]

واتە/ جنێودان بە موسڵمانان ((فاسق)) بوونەو کوشتنیشی کوفرە.

یان دەفەرموێت: ((**لا يزني الزاني حين يزني وهو مؤمن، ولا يسرق السارق حين يسرق وهو مؤمن، ولا يشرب الخمر حين يشربها وهو مؤمن**))[٦٦]

واتە/ هیچ زیناکەرێك نیـیە کاتیّ زینا دەکات باوەڕی هەبیّ وە هیچ دزێك نیـیە کاتێك دزی دەکات باوەڕی هەبیّ، وە هیچ ئارەق خۆرێك نیـیە لەکاتی ئارەق خواردنەکەیدا باوەڕی هەبێت.

لێرەدا ئەم جۆرە کوفرانە خاوەنەکەی پێیان لەدین دەرناچێت بەڵام گوناهو تاوانی گەورەن و پێویستە مرۆڤ بە زووترین کات دەستیان لیّ هەڵبگرێت.

---

[٦٥] رواه البخاري.

[٦٦] رواه مسلم.

# وانەی حەوتەم:

# دوو ڕوویی ((النفاق))

دووڕوویی دوو جۆری هەیە:

١- دووڕوویی لە باوەڕ ((اعتقاد))دا یان دووڕوویی گەورە.

٢-دووڕوویی کرداری ((عملي)) یان دووڕوویی بچووک.

## ١) دووڕوویی گەورە ((النفاق الاكبر))

بریتی‌یە لەوە کە بە زمان باوەڕو ئیسلام بوونی خۆی ئاشکرا بکات و وەک دیاردەیەکی ڕووکاری کار بە شەریعەتی ئیسلام بکات بەڵام لە دڵ و ناوەوەیدا بێ بڕوایەو ڕاست ناکات، لەبەر ئەوە ئەم جۆرە کەسانە بێ باوەڕن.

وە هەروەها زۆر جار دووڕووان (المنافقون) ناناسرێن چونکە بێ باوەڕیەکەیان دەشارنەوە لەبەر ئەوە ئەو دووڕوویییەیان لە کوفرەکە زۆر خراپترە، هەر لەبەر ئەوەشە سزایان لە سزای بێ باوەڕان توندترو خراپترە، ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ان المنافقين في الدرك الاسفل من النار﴾[٦٧]

واتە/ بێ گومان دووڕووان لەناو هەرە قوڵایی دۆزەخ دان.

## ٢) دووڕوویی بچووک ((النفاق الأصغر)):

ئەمەش جۆرێکی تری دووڕووییو نفاقە پەیوەستە بە هەڵس و کەوت و کردارەوە، وە لێرەدا باوەڕ دەمێنێتەوەو جیلوازی هەیە لەگەڵ ((دووڕوویی گەورەدا)) بەڵام لێرەدا ئەو کەسە دەبێتە هەڵگری سیفاتی دووڕووان و لە ئەوان دەچێت و لێیان نزیک دەبێتەوە.

---

[٦٧] النساء/١٤٥

وێنەی ئەمانەش وەکو لە فەرموودەی پێغەمبەری پێشەوامانداﷺ هاتووەو دەفەرموێت: ((آية المنافق ثلاث: اذا حدث كذب واذا وعد أخلف واذا اؤتمن خان))[٦٨]

واتە/ نیشانەکانی دووڕوو سێ شتن: ئەگەر قسەی کرد درۆ دەکات، ئەگەر بەڵێنیدا نایگەیەنێتە جێ، ئەگەر ئەمانەتی لا دانراخیانەتی لێ دەکا.

وە لە فەرموودەیەکی تریشدا کە دەفەرموێت: ((اربع من كن فيه كان منافقاً خالصاً ومن كانت فيه خصلة منهن كانت فيه خصلة من النفاق حتى يدعها اذا اؤتمن خان واذا حدث كذب واذا عاهد غدر واذا خاصم فجر))[٦٩]

لێرەدا مەبەستەکە لە (كان منافقاً خالصاً) واتە زۆر لە دووڕووان دەچێت نەک بووبێتە دووڕوویەکی یەکجاری وە زیاتر بۆ بەهۆش هێنانەوەو ترساندنی موسڵمانە لەو کارە ناپەسندانە نەوەک لە کۆتاییدا بە هۆیانەوە ببنە دووڕووی تەواو.

## طاغوت چی‌یە؟

طاغووت ووشەیەکی زۆر فراوانە وە گەلێک شت دەگرێتە خۆی بە کورتی بە هەموو پەرستراوێک دەگوترێت جگە لە خوای پەروەردگار، کەوا بوو هەر شتێک ئادەمیزاد بیپەرستێت یا خود بەشێوەیەک پەیوەست بێت پێوەی کە نەتوانێ لە فەرمانی دەرچێت یاخود شوێن کەوتنی بە پێویست بزانێت یاخود گوێ ڕایەڵی فەرمانەکانی بکرێت ئەو شتەشی دژی قورئان و سوننەت بێت جا بەهەر شتێکەوە ناو ببرێت بۆ نموونە/ پێی بگوترێت مامۆستایان شێخ یان حیزب یان مەزهەب یان قانون... هتد لە ڕاستیدا ئەوە دەبێت بە طاغووت.

* خوای گەورە فەرمانی چی پێ کردووین؟

فەرمانی پێ کردووین بەوەی کە بە تەنها بیپەرستین و لە طاغووت پەرستی دوور کەوینەوە: ﴿ولقد بعثنا في كل أمة رسولاً ان اعبدوا الله واجتنبوا الطاغوت﴾[٧٠]

واتە/ ئێمە بۆ هەموو گەل و چینێک پێغەمبەرو نێرراوێکمان بۆ ناردوون تاوەکو پێیان

---

[٦٨] اخرجه البخاري ومسلم والترمذي.

[٦٩] رواه البخاري ومسلم.

[٧٠] النحل/٣٦.

ڕابگەیەنن کە بە تەنها هەر خوای پەروەردگار (ا لله) بپەرستن و ئـەنجا لـە طـاغووتیش دوور کەونەوە.

✻ طاغووت و جۆرەکانی:

✻ طاغووتەکان چەند جۆری سەرەکین؟

و/ دەکرێن بە پێنج جۆری سەرەکی‌یەوە:

یەکـەم/ شـەیتان: کـە گـەورەترین پاڵنـەرو هـاندەری ئـادەمیزادە بـۆ دوور کەوتنـەوە لـە پەرستنی خوا بە تەنهاو گەورەترین دوژمنی ئـادەمیزادە ﴿ألم أعهـد اليكـم يـا بـني آدم ان لا تعبدوا الشيطان انه لكم عدو مبين﴾[71]. واتە/ مەگەر بەڵێنم لێ وەرنەگرتبوون ئەی نەوەکانی ئادەم کە شەیتان نەپەرستن چونکە دوژمنێکی ئاشکرای ئێوەیە؟!!.

دووەم/ هەموو کار بەدەستێکی ستەم کار کە پێچەوانەی یاسای ئیسلام بجولێتەوەو حوکم و یاسایەکی تر بەسەر خەڵکیدا بسەپێنێ یاخود یاساکانی ئیسلام بگۆڕێو دەست کاریان بکات ﴿الم تر الى الذين يزعمون أنهم آمنوا بما انزل من قبلك يريدون ان يتحاكموا الى الطـاغوت وقد امروا ان يكفروا به ويريد الشيطان ان يضلهم ضلالاً بعيداً﴾[72]

زۆر جاری وا هەیە ئادەمیزاد لەبەر نەزانیو نەفامی خـۆی دەکەوێتـە نـاو بازنـەی طـاغوت پەرستی‌یەوە بە خۆشی نازانێ بە نموونە/ گوێ ڕایەڵی کردنی ئەو کەسانەی کە بە ناوی دینەوە سەر لە خەڵک دەشێوێنن و بەبێ زانیاری فتوایـان بـۆ دەدەن و حـەڵاڵ حـەرام دەکـەن و حـەرام حەڵاڵ دەکەن.

سێیەم/ هەر کەسێک خۆی وا نیشانی خـەڵکی بـدات کـە غـەیب دەزانـیو توانـای دەرک کردنی شتە شاردراوەکانی هەیە ئەویش هەرطاغووتە، چونکـە زانینـی غـەیب تایبەتـە بـەخوای پەروەردگارەوە ﴿وعنده مفاتيح الغيب لا يعلمها الاّ هو﴾[73]

---

[71] يس/٦٠

[72] النساء/٦٠

[73] الأنعام/٥٩.

وه فەرموویەتی: ﴿قل لا يعلم من في السموات والارض الغيب الاّ ا لله﴾[٧٤]

واتە/ پێیان بڵێ هیچ کامێک لەوانەی لە ئاسمانەکان و زەوی دان شتی پەنهان نازانن جگە لەخوا.

چوارەم/ ئەو کەسەی لە غەیری خوا دەپەرستریو ڕازییەو بێ دەنگە لە ئاستی دیاردەکانی ﴿ومن يقل منهم اني اله من دونه فذلك نجزيه جهنم كذلك نجزي الظالمين﴾[٧٥]

واتە/ هەر کەسێک بڵێ من پەرستراوم لە جێگەی خوا ئەوە پاداشتی بەدۆزەخ دەدەینەوە، بەم شێوە پاداشتی ستەمکاران دەدەینەوە.

پێنجەم/ ئەو کەسەی کار بە قورئان و سوننەت ناکاو بەرنامەی خوا ناکاتە پێشڕەوو پێشەنگ لە ژیانیدا ﴿ومن لم يحكم بما انزل ا لله فاولئك هم الكافرون﴾[٧٦]

واتە/ هەر کەسێک یا هەر کۆمەڵێک حوکم نەکات بەو بەرنامەی کە خواناردوویەتی ئەوە ئەوانە بێ باوەڕو کافرن.

[٧٤] النمل/٦٥

[٧٥] الانبياء/٢٩

[٧٦] المائدة/٤٤

# وانەی هەشتەم:

# پێناسەی چەند زاراوەیەک لەبواری بیرو باوەڕدا

## ١) اللوح والقلم:

((لوح)) یان ((اللوح المحفوظ)) یان ((ام الکتاب)).

ئەو تەختەیە کە خوای پەروەردگار ئەندازەی هەموو شتێکی تێدا نووسیوە پێش ئەوەی ئاسمان و زەمین دروست بکات.

بەڵگە/ **((عن عبدا لله بن عمرو –رضي ا لله عنهما– عنهما عن النبيﷺ قال: کتب ا لله مقادير الخلائق قبل ان يخلق السموات والارض بخمسين الف سنةٍ))**[٧٧]

واتە/ خوای گەورە ئەندازەی هەموو بوونەوەرێکی لە ((لوح))دا نووسیوە پێش ئەوەی ئاسمان و، زەوی دروست بکات بە پەنجا هەزار ساڵ.

((القلم)): ئەو پێنووسەیە کە خوای گەورە هەموو شتێکی لە ((اللوح المحفوظ))دا پێ نووسیوە.

**((عن عبادة بن الصامت (رضي ا لله عنه)) قال: سمعت رسول ا للهﷺ يقول: أول ما خلق ا لله تعالى القلم، فقال له: اکتب قال: يا ربّ وما أکتب؟ قال: اکتب مقادير کل شيء حتى تقوم الساعة))**[٧٨]

**٢) الکوثر:** ڕووبارێکە لە بەهەشت خوای گەورە پەیمانی داوە کە بیدات بە

---

[٧٧] رواه مسلم.

[٧٨] حديث صحيح رواه ابو داود.

پێغەمبەری ئازیزمانﷺ زۆر بەپیتەو سەم ڕووبارە دەڕژێتە ناو حەوزێک و ئوممەتی پێغەمبەرﷺ دەچێتە سەر ئەو حەوزەو ئاو دەخواتەوە، جامی ئاو خواردنەوەکەی بەقەد ئەستێرەکانە.

**عن عبدا لله بن عمرو رضي ا لله عنهما قال: قال النبيﷺ ((حوضي مسيرة شهر وزواياه سواءٌ وماؤه ابيض من الورق وريحه أطيب من المسك وكيزانه كنجوم السماء فمن شرب منه فلا يظمأ بعده ابداً))**[79]

واتە/ حەوزەکەی من بەئەندازەی مانگە ڕێیەک گەورەیە درێژی و پانی یەکسانە ئاوەکەی لە زیو سپی ترە بۆنەکەی لە میسک خۆشترە گۆزەی ئاو خواردنەوەی بەقەد ئەستێرەکانی ئاسمانە هەر کەسێک جارێک لیٚی بخواتەوە هەتا هەتایە تینو نابێتەوە.

## ٣) الاسراء والمعراج:

بریتی‌یە لە شەوڕۆیی کردنی پێغەمبەرﷺ بە لاشەو بەگیان لە مەککەی پیرۆزەوە بۆ ((**المسجد الاقصی**)) لە یەک شەودا وە سەرکەوتنی لە ((**المسجد الاقصی**)) وە بۆ سەرەوەی حەوت ئاسمانەکان لە هەمان شەودا ئەم ڕووداوە گرنگەی پێغەمبەرﷺ لە (٢٧)ی مانگی (ڕەجەب) بوو بە ساڵێک و دوومانگ پێش کۆچ کردن.

**﴿سبحان الذي أسرى بعبده ليلاً من المسجد الحرام الى المسجد الاقصى﴾**[80]

واتە/ پاک و بێ عەیبی بۆ ئەو خوایەی شەوڕەوی بە بەندەی خۆی (محمد)ﷺ کرد لە (المسجد الحرام)وە بۆ (**المسجد الاقصی**)بەیەک شەو (لەیەک شەودا).

## ٤) الولاء والبراء:

= دۆستایەتی ((الولاء)): ئەوەیە موسڵمان لە پێناوی خوادا، خواو پێغەمبەریﷺ

[79] رواه البخاري ومسلم واللفظ له

[80] الاسراء ١

موسڵمانانی خۆش بوێت و، پشتگیریان بکات و کۆمەکیان زۆر بکات و دژایەتی دوژمنی نایینیان بکات.

= دوژمنایەتی ((البراء)): ئەوەیە موسڵمان لە پێناوی خوادا دژایەتی دوژمنانی خواو پێغەمبەرﷺ و موسڵمانان بکات وە پشتگیریان نەکات، هەر چەند ئەو دوژمنانەش خزم و کەسی خۆی بن وە کۆمەڵگەیان زۆرنەکان.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿**إنما وليكم الله ورسوله والذين آمنوا الذين يقيمون الصلاة ويؤتون الزكاة وهم راكعون**﴾[81]

واتە/ بێ گومان دۆستی ئێوە تەنها خواو پێغەمبەری خواﷺو ئیماندارەکانن، ئەو جۆرە ئیماندارانەی نوێژ دەکەن و زەکات دەدەن و مل کەچی فەرمانی خواو پێغەمبەرنﷺ.

وە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿**إن الكافرين كانوا لكم عدواً مبيناً**﴾[82]

واتە/ بەڕاستی کافرو بێ بڕواکان دوژمنی ئاشکراو ڕاستەقینەی ئێوەن.

وە دەفەرموێت: ﴿**ولا تركنوا الى الذين ظلموا فتمسكم النار**﴾[83]

واتە/ دڵتان بەلای ستەم کارانەوە نەڕوات، نەوەکو ئاگری دۆزەخ بتانگرێتەوە.

## ٥) صحف الاعمال:

لەدوای وەستان لەبەردەست خوای گەورەو پرسیار لێ کردن هەموو کەسێک لە ڕۆژی دواییدا دەفتەری کردەوەکانی کە لە دنیادا فریشتەکانی ڕاست و چەپی نووسیبویان وەردەگرێتەوە خوای گەورە فەرمانی پێ دەکات ﴿**اقرأ كتابك**﴾[84] دەفتەری کردەوەکانت بخوێنەوە، ئەو کاتە هەموو کەس خوێندەواری بووبێ یان نا هەرخۆی دەفتەری کردەوەکانی دەخوێنێتەوە، ئەو کاتە ئیماندار بەدەستی ڕاست وەری دەگرێتەوە وە کافریش بەدەستی چەپ.

---

[81] المائدة/ ٥٥

النساء ١٠١

هود/ ١١٣

الاسراء ١٤

﴿فاما من أوتي كتابه بيمينه فسوف يحاسب حسابا يسيرا وينقلب الى اهله مسرورا واما من أوتي كتابه وراء ظهره فسوف يدعوا ثبورا ويصلى سعيراً﴾[85]

واتە/ هەر کەسێک دەفتەری کردەوەکانی بەدەستی ڕاست بدرێتەوە، ئەمە لێکۆڵینەوەیەکی کەمی لەگەڵ دەکرێو بە دڵخۆشی‌یەوە دەچێتە بەهەشت، بەڵام هەر کەسێک لەلای پشتەوەی دەفتەرەکەی بدرێتەوە یان بەدەستی چەپ وەری بگرێ ئەوە هاواری قوڕبەسەری ئەکات و دەچێتە دۆزەخ.

## ٦) پردی ((الصراط)):

کە قۆناغەکانی گۆڕەپانی مەحشەر کۆتایی هات پردێک لەسەر دۆزەخ دادەنرێت تاکو ئەم خەڵکە لەسەر پردەکەدا ڕا ببرێت بۆ بەهەشت ئینجا بەر لە پردەکە تاریکایی‌یەک هەیە کە ئیماندارو دووڕووەکان لێک جیا دەبنەوە تەنها ئیماندارەکان بە ئەندازەی کردەوە باشەکانیان ڕووناکی‌یان دەدرێتێ بەسەر پردەکەدا تێ دەپەڕن.

﴿وان منكم الاّ واردها كان على ربك حتماً مقضياً ثم ننجي الذين اتقوا ونذر الظالمين فيها جثياً﴾[86]

واتە/ هەموو کەسێکتان دەبێ بەسەر دۆزەخدا ڕابرێ خوا بڕیاری داوەو بڕاوەتەوە ئەنجا ئەوانەی خۆیان لە تاوان پاراستووە ڕزگاریان دەکەین و ستەمکارانیش لەناو دۆزەخدا دەهێڵینەوە.

((عن ابي سعيد الخدري رضي الله عنه في حديثه الطويل: قال النبي ﷺ.... ثم يضرب الجسر على جهنم وتحلّ الشفاعة، فيقولون: اللهم سلّم سلّم قيل يا رسول الله وما الجسر؟ قال دَحْض مَزَلّة فيه خطاطيف وكلاليب وحسل، فيمر المؤمنون كطرف العين وكالبرق وكالريح وكالطير وكأجاويد الخيل والركاب فناج مسلم ومخدوش ومكدوس في نار جهنم))[87]

---

[85] الانشقاق/٧-١٠

[86] مريم/٧١-٧٢

[87] رواه البخاري ومسلم.

واتە/ ئینجا پرد لەسەر دۆزەخ دادەنرێت و کاتی شەفاعەت دێو دەڵێن: خوایـە سـەلامەت بکە سەلامەت بکە گوترا: ئەی پێغەمبەری خواﷺ ئەم پردە چییە؟ فەرمووی پردێکی لووسەو قاچ لێی رادەخزێو لەم لاو لەولا قولاپ و درکی پێوەیە ئیمانداران بەسەریدا رادەبوورن: هەندێک وەک چاو نوقاندێک وەک بروسک وەک با وەک باڵندە وەک سوار ئەسپی چاک ئـەنجا ئەم خەڵکە سێ بەشە: هەیە بـە سـەلامەتی رزگاری دەبێـت هیـچ قولاپێـک نـایگرێت، هەیـە: قولاپەیکان دەیگرن و برینداری دەکەن و بەری دەدەن و رادەبورێ هەیە بە کۆمەڵ بەسەر یـەکدا فڕێ دەدرێنە ناو دۆزەخ.

## ٧) الكاهن والعراف:

ئێمەی موسڵمان و خاوەن بڕوا بە خوای کاربەجێو زانـا بەهـەموو شـتێ هـەرگیز بـاوەڕ بـە (فاڵچیو کاهن) ناکەین ئەوانەی کە دەڵێن: ئێمە بـەهۆی فـاڵ گرتنـەوە شـوێنی دزیو (دزراو) وون بوو و بەختەوەریو بەدبەختی... هتد دەزانین یـان ئەوانـەی کـە دەڵێـن: ئێمـە بـە زانسـتی نادیار (علم الغیب) دەزانین. چونکە ئەوانە گشتیان نادیارن و تایبەتن بەخوای گەورە وە کـەس نییە دەمیان لێ بکوتیو خۆی بە شارەزا لێیان بداتە قەڵەم.

**﴿عالم الغيب فلا يظهر على غيبه احداً الاّ من ارتضى من رسول﴾**[88]

واتە/ خوای گەورە زانای زانستی نادیارەو هیچ کەس شارەزایی نادیاری خۆی ناکات تـەنها ئـەو پێغەمبـەرە نـەبێت کـە خـۆی هـەڵی دەبژێـریو پـێی رازییـە زانسـتی نادیـاری بداتـێ.

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: **((من أتى عرافاً فسأله عن شيء لم تقبل له صلاة اربعين ليلة))**[89]

واتە/ هەر کەسێک بچێتە لای فاڵچیو پرسیاری لێ بکات لە شـتێک ئـەوە خـێری نوێـژی چل شەوی بۆ نانوسرێت.

**وفي رواية الامام احمد ((من أتى عرافاً او كاهناً فصدقه بما يقول فقد كفر بما انزل على محمدﷺ))**[90]

---

[88] الجن/٢٦

[89] رواه مسلم.

[90] صحيح رواه احمد.

واتە/ هەر كەسێك بچێتە لای فالچی یان لای ئەو كەسەی زانستی نادیار دەڵێ و باوەڕیشی پێ كرد بەڕاستی ئەوە كوفری كردووە بەو قورئانەی بۆ پێغەمبەرﷺ هاتۆتە خوارێ.

## * ڕاهێنانی گشتی:

بۆ ئەوەی مامۆستا بتوانێت ئەو قوتابیەی كە پەروەردەی دەكات بیر ڕۆشن ولێ هاتوو دەرچێت وە ئەو وانانەی بۆی باس دەكات هەمیشە بە تاسەو چێژەوە گوێی بۆ بگرێت پێویستە هەر جارە پرسیارێك یان چەند پرسیارێكی لەو بارەوە كو خوێندوویەتی لێ بكات بۆ ئەوەی بگەڕێت بە شوێن وەڵامەكەیداو بۆی بهێنێتەوە، وە مامۆستا خۆشی دوایی بە تێرو تەسەلی وەڵامەكەی بۆ باس بكا، بەم شێوەیە قوتابی هەمیشە گورج و گۆڵ دەردەچێت و هەست بەوە دەكات كە رۆژ بەڕۆژ فێری زانیاری تازە دەبێت و وە ئەو وانانەی كە دەیخوێنێت پڕ سوود دەبێت بۆی.

ئێستاش بۆ نموونە چەند پرسیارێك دیاری دەكەین لەم بارەوە بۆ ئەوەی مامۆستا ئاراستەی قوتابیانی بكات.

١) جبریل داوای كرد لە پێغەمبەری خواﷺ هەواڵم بدەیە دەربارەی (ئیمان)؟ ئایا پێغەمبەری خواﷺ چی وەڵام دایەوە؟ وە ئایا دەزانی ئەو فەرموودەیە كێ گێڕاویەتیەوە واتە (**راوي حديث**)ەكە كێیە؟

٢) مەرجەكانی موسڵمانی ڕاستەقینە چیە؟ ((**شروط المسلم**)).

٣)ئایا دەتوانی مەرجەكانی وەرگرتنی تەوبەو پەشیمانی دەست نیشان بكەی؟ ((**شروط قبول التوبة**)).

٤) خوای گەورە ئێمەی بۆچی دروست كردووە؟ ئایا دەتوانی بە بەڵگەی ئایەت و فەرموودە بیسەلمێنی؟

٥) مەرجەكانی وەرگرتن و دروستی كارو كردەوە چیە؟ ((**شروط قبول العمل**)).

٦) ئایا لەنێوان (حق) و (**باطل**)دا ڕێگەیەكی مام ناوەندی هەیە كە خەڵك لەو بەینەدا بوەستێت؟ بە بەڵگە بیسەلمێنە؟

٧) گەورەترین گوناهـ لای خوای گەورە چی‌یە؟ بە ئایەت یان فەرموودە بیسەلمێنە.

٨) ئایا دوعاو نزا بە عیبادەت دادەنرێ؟ بەڵگەت چی‌یە؟

٩) ئایا دروستە ١-نەزر (النذر) کردن بۆ غەیری خوا؟ ٢-سەربڕین بۆ غەیری خوا؟

١٠) حوکمی کارکردن بە یاسایەکێ پێچەوانەی ئیسلام بێت چی‌یە ڕوونی بکەرەوە بە بەڵگەوە؟

١١) ئایا دروستە سوێند خواردن بە غەیری خوای گەورە؟ بە بەڵگەوە.

١٢) بۆچی خوای پەروەردگار جیهادو تێکۆشانی فەرمان پێ داوە لە ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا؟

١٣) ئایا دروستە خۆشویستنی بێ باوەڕان و سەرخستنیان؟

١٤) احسان لە (**عیبادة**)دا کامەیە پێناسەی بکە؟

١٥) خوای گەورە پێغەمبەرانی بۆچی ناردووە ڕوونی بکەرەوە؟

١٦) سوودەکانی یەکتاپەرستی ((التوحید)) چی‌یە؟

١٧) نیەت چی‌یەو دەوری چی‌یە لەکاری ئیسلامی‌و بیرو باوەڕدا؟

١٨) مانای (الولاء والبراء) چی‌یە؟

١٩) پێناسەی (*الشرك الاكبر*)و (*الشرك الاصغر*) بکەو وە جیاوازی‌یان چی‌یە؟

٢٠) (*اولیاء الرحمن*) بەکێ دەگوترێت؟

٢١) حوکمی (سیحر) چی‌یە لە ئیسلامدا؟

٢٢) ئایا دروستە ئەڵقەو مليوان لەبەر کردن بۆ ئەوەی شیفای نەخۆش بدات و رزگاری بکا لە بەڵاو ناڕەحەتی؟

## * وەڵامی هەندێک لە پرسیارەکان:

١) **قال رسول الله ﷺ: الایمان ان تؤمن با لله وملائكته وكتبه ورسله واليوم الآخر وتؤمن بالقدر خيره وشره.** فەرموودەکەش (مسلم) گێڕاویەتەوە.

٢) خوای گەورە بۆ ئەوە دروستی کردووین کە بیپەرستین و هاوەڵی بۆ بڕیار نەدەین. بەڵگەش بە ئایەت/ ﴿**وما خلقت الجن والانس الاّ ليعبدون**﴾**الذاريات/٥٦**.

بەڵگەش بە فەرمووده/ ((حق الله على العباد ان يعبدوه ولا يشركوا به شيئا)) متفق عليه.

٣) مرۆڤ نابێتە موسڵمانی ڕاستەقینە تاوەکو ئەم مەرجانەی تێدا نەیەتە دی:

أ) پێویستە لە عیبادەت و پەرستندا یەکتاپەرست و تەنها خواپەرست بێت وە کار بە واجبەکانی خواپەرستی بکات.

ب) بەڕاست زانینی پێغەمبەرﷺ وە ئەوەی کە بۆی هاتووە لەگەڵ ئەوەشدا بەگوێ کردنی فەرمانەکانیو دوور کەوتنەوە لەو شتانەی کە نەهی لێ کردووە.

جـ) دژایەتی کردنی کافران و هاوبەشی پەیدا کەران بۆ خوای گەورە.

د) هەستان بە واجبی ئامۆژگاری کردن.

﴿ادع الى سبيل ربك بالحكمة والموعظة الحسنة وجادلهم بالتي هي احسن﴾النمل/١٢٥

٤) مەرجەکانی وەرگرتنی تەوبەکردن ئەمانەن:

أ) اخلاص: دەبێت گوناهبار بە پاکیو دڵسۆزی تەوبە بکات بۆ لای خوای گەورە نەك بۆ کەسێکی تر.

ب) پەشیمانی (الندم): دەبێت پەشیمان بێت لەو کردەوەیەی کە کردوویەتی.

جـ) ڕیشەکێش کردن و وازهێنانی یەکجاری (الإقلاع).

د) دەبێت هەوڵ بدات کە هەرگیز جارێکی تر نەگەڕێتەوە سەر ئەو گوناهە.

و) مافی خەڵکی بداتەوە کە لەلایەتی یان گەردنی خۆی پێ ئازاد بکات.

ز) پێویستە ئەو تەوبەو پەشمانییە لە ژیاندا بێت و پێش هاتنی سەرەمەرگی بێت.

پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێت: ((ان الله يقبل توبة عبده ما لم يغرغر)) ((حسن رواه الترمذي)).

٥) مەرجەکانی وەرگرتنی کردەوە:

أ) باوەڕ بە یەکتایی خوای گەورە:

﴿ان الذين آمنوا وعملوا الصالحات كانت لهم جنات الفردوس نزلاً﴾ الكهف/١٠٧

ب) الاخلاص: کارکردن بۆ خوای گەورە بەبێ ڕیاو بەپاکی.

جـ) ئەو کردەوەیە پێویستە گونجاو بێت لەگەڵ ئەوەی کە پێغەمبەری خواﷺ هێناویەتی

﴿وما آتاكم الرسول فخذوه وما نهاكم عنه فانتهوا﴾الحشر/٧

د) دەبێت خاوەنی کردەوە کە باوەڕەکەی هەڵنەوەشێنێتەوە بە کافربوونی یان هاوەڵ بڕیاردان بۆ خوای گەورە.

٦) نەخێر هیچ ڕێگاو شتێک نییە لەنێوان حەق و (باطل)دا تاوەکو کەسێک هەڵبژێرێت چونکە خوای گەورە دیاری کردووە بۆمان کە دوای حەق و ڕاستی ئەوە گومڕایی و سەرلێ شێوانە.

بەڵگە/ خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فماذا بعد الحق الاّ الضلال﴾یونس/٣٢.

٧) گەورەترین گوناهـ بریتییە لە:

هاوەڵ بڕیاردان بۆ خوای گەورە.

بەڵگەش/ ﴿یا بني لا تشرك با لله ان الشرك لظلم عظیم﴾لقمان/١٢

بەڵگە بە فەرموودە/ پرسیاز کرا لە پێغەمبەرﷺ چ گوناهێک زۆر گەورەیە ئەویش فەرمووی: ((ان تجعل لله نداً وهو خلقك))متفق علیه.

واتە/ ئەوەیە کە شەریک و هاوەڵ بۆ خوا دیاری بکەی کاتێک کە هەر ئەویش دروستی کردووی.

٨) بەڵێ دوعاو نزا بە عیبادەت کردن بۆ خوا دادەنرێت.

﴿وقال ربكم ادعوني استجب لكم ان الذین یستكبرون عن عبادتي سیدخلون جهنم داخرین﴾غافر/٦٠

وە پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێت: ((الدعاء هو العبادة)). رواه الترمذي وقال حسن صحیح.

٩) أ- نەزرکردن دروست نییە بکرێت بۆ خوای گەورە نەبێت واتە تەنها دەبێت بۆ خوا بێت یان بۆ گوێ ڕایەڵی و خواپەرستی بێت.

وەک قورئان بەسەرهاتەکەی ئافرەتەکەی ((عمران))مان بۆ دەگێڕێتەوە دەفەرموێت: ﴿رب اني نذرت لك ما في بطني محرراً﴾آل عمران/٣٥

پێغەمبەری خواشﷺ دەفەرموێت: ((من نذر ان یطیع ا لله فلیطعه، ومن نذر ان یعصیه فلا یعصیه)) رواه البخاري.

واتە/ ئەو کەسەی نەزر دەکات بۆ ئەوەی گوێ ڕایەڵی خوا بکات ئەوە با بیکات وە ئەو کەسەی نەزر دەکات بۆ ئەوەی سەرپێچی لە فەرمانی خوا بکات ئەوە با سەرپێچی یە نەکات.

ب) وە هەروەها سەربڕینیش ((**الذبح**)) تەنها بۆ خوا دروستە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿**فصل لربك وانحر**﴾ **الكوثر/٢**

(**نُحر**) = سەربڕین.

وە پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێت: ((**لعن ا لله من ذبح لغير ا لله**))**رواه مسلم**. واتە خوا لەعنەتی لەو کەسە کردووە کە بۆ غەیری خوا حەیوان سەر دەبڕێت.

١) کارکردن بە یاسایەکی پێچەوانەی یاساو شەریعەتی ئیسلام بێت ئەوە کوفرو بێ بڕوایی یە یان بەچاکی بزانێت و بیکاتە هاوتای شەریعەتی ئیسلام یان بڕوای وا بێت لە ئیسلام چاکترەو ئەوانە هەمووی دەبێتە هۆی بێ باوەڕ بوونی خاوەنەکەی.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿**ومن لم يحكم بما انزل ا لله فأولئك هم الكافرون**﴾**المائدة/٤٤**.

واتە: هەر کەسێک حوکم بەوە نەکات کە خوا ناردوویە خوارەوە ئەوە لە بێ باوەڕانە.

﴿**ومن يبتغ غير الاسلام ديناً فلن يقبل منه**﴾**آل عمران/٨٥**.

واتە/ هەر کەسێک جگە لە ئیسلام بەرنامەیەکی تر هەڵبژێرێت ئەوە لێی وەرناگیرێ.

١١) سوێند خواردن بە غەیری خوا دروست نییە.

بەڵگەش/ **قال رسول ا للهﷺ**: ((**من حلف بغير ا لله فقد أشرك**)) **صحيح رواه احمد**.

هەروەها دەفەرموێت: ((**من كان حالفاً فليحلف با لله او ليصمت**)) **متفق عليه**.

واتە/ هەرکەس سوێند دەخوات با تەنها بەخوا سوێند بخوات یان بێ دەنگ بێت.

١٢) خوای گەورە جیهادو تێ کۆشانی لەبەر کۆمەڵێ خاڵ بە شەرع داناوە بۆ ئێمەی موسڵمان بۆ نموونە:

أ) بۆ بەرگری کردن لە نەهێشتنی ((شرك)) (ومشركين) چونکە خوای گەورە هەرگیز شەریک بڕیاردان قبوڵ ناکات و پێی ڕازی نییە.

ب) بۆ لابردنی ئەو ڕێگرانەی دەبنە کۆسپ لە بەردەم بانگەواز کردن بۆ لای خوای گەورە.

جـ) بۆ پاراستنی عەقیدەو بیروباوەڕ لە هەموو خەم و ترسێک کە هەڕەشەی لابردنی بکات.

د) بۆ بەرگریو پاراستنی موسڵمانان و خاك و ئاوی موسڵمانان.

١٣) سەرخستن و خۆش ویستنی بێ باوەڕان دروست نی‌یە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ومن يتولهم منكم فانه منهم﴾ المائدة/٥١.

واتە/ هەر کەسێ لە ئێوە بێ باوەڕانی خۆش بوێت و کۆمەکیان بکات ئەوە ئەویش لەوانە.

وە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((ان آل أبي فلان ليسوا لي بأولياء))[٩١]

واتە: ئال و خزمەکانی باوکی فلانە کەسە دۆست و یارمەتی دەرو والی من نین.

---

[٩١] متفق عليه

# بەشی (٤)

# خواپەرستی ((العبادة))

لەدوای ئەوەی مامۆستا لە قۆناغی یەکەم و دووەمی (پرۆگرامی پەروەردەی منداڵان) دەبێتەوە لە بەشی خوا پەرستیدا، ئنجا پێویستە وانەکانی ئەم قۆناغەش ببەستێتەوە بە هەردوو قۆناغی یەکەم و دووەمەوە.

# وانەی یەکەم:

# نــویــــــــژ (الصلاة) (١)

## * پلەو پایەی نوێژ لە ئیسلامدا:

بێ گومـان نوێـژ پلـەو پایەیـەکی زۆر بـەرزی هەیـە لـە ئیسـلامدا دووەم پایـەو کۆڵەکـەی ئیسلامە لەدوای شایەتمان ((الشهادتین)) هەروەکو پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: **((رأس الأمـر الاسلام وعموده الصلاة وذروة سنامه الجهاد))**[٩٢]

واتە/ سەری هەموو کارو فەرمانێک ئیسلامەو کۆڵەکەو پایەکەشـی نوێـژەو پۆپـەی هـەرە بەرزیشی جیهادو تێ کۆشانە لەڕێی خوادا.

وە هەروەها یەکەم خواپەرستی‌یە کە خوای گەورە پێویستی کـردووە لەسـەر بـەندەکانی بـە قسەکردن و وەحی ڕاستەوخۆ لەگەڵ پێغەمبەرﷺ لـە شـەوی بـەرز بوونـەوە ((المعـراج))دا بـۆ ئاسمان.

وە هەروەها یەکەم شتێکیشە کـە بـەندەکان لـێ پرسـینەوەیان لەسـەری دەکرێـت لـە ڕۆژی دواییدا وەکو پێغەمبەری خواﷺ دەفـەرموێت: **((اول مـا يحاسـب عليـه العبـد يـوم القيامـة الصلاة فان صلحت صلح سائر عمله وان فسدت فسد سائر عمله))**[٩٣]

واتە/ یەکەم شتێک کە بەندە لێپرسینەوەی لەسەر دەکرێت لە ڕۆژی دوایی‌دا نوێـژە ئینجـا ئەگەر نوێژەکەی ڕاست و دروست بوو ئەوا سەرجەمی کردەوەکانی دیکەی باش دەبێت وە ئەگەر نوێژەکەی نا دروست و خراپ بوو ئەوا سەرجەمی کردەوەکانی دیکەشی خراپ دەبێت.

وە هەروەها نوێژ دواترین شتێکە کە پێغەمبەرﷺ لەکاتی سەرەمەرگ و گیان دەرچوونیـدا ئامۆژگاری ئوممەتەکەی پـێ کـردووە کـە دەیفـەرموو: **((الصــلاة الصــلاة ومـا ملكـت**

---

[٩٢] رواه مسلم.

[٩٣] رواه الطبراني صحيح الجامع للالباني/ ٢٥٧٠

ايمانكم))[٩٤]

واته/ ئاگاداری نوێژەکانتان بن، نوێژەکانتان وە ئاگاداری ئەو کەنیزەك و ئافرەتانە بن کە لەژێر دەستی ئێوە دان.

*** حوکمی نوێژنەکەر:** هەموو زانایان هاودەنگن لەسەر ئەوە کە هەر کەسێك نوێژ نەکات و نکوڵی لێ بکات و بڕوای پێ نەبێت ئەوە بێ گومان بەم کارەی لەدین دەردەچێت و کافر دەبێت بەڵام ئەو کەسەی بڕوای پێیەتی‌و لەبەر تەمبەڵی یان بەهۆی ئیش و کاری دنیاییەوە دەیفەوتێنی‌و نایکات ئەوا زانایان دوو بۆچوونیان هەیە:

أ) کۆمەڵێکیان دەفەرموون هەر کەسێك نوێژ نەکات هەر چەندە بڕواشی پێی هەبێت ئەوە کافر دەبێت وە بەڵگەش دەهێننەوە بە قورئان و بە فەرمودەی پێغەمبەرﷺ خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿**فويل للمصلين الذين هم عن صلاتهم ساهون**﴾[٩٥]

واتە: سزاو لەناوچوون بۆ ئەو نوێژ کەرانەی کە بێ ئاگان لە نوێژەکانیان و لە کاتی خۆیان دوایان دەخەن.

وە ﴿**فخلف من بعدهم خلف اضاعوا الصلاة واتبعوا الشهوات فسوف يلقون غياً**﴾[٩٦]

واتە: ئنجا هات لەدوای ئەوان پاشماوەی خراپ و منداڵی نارەسەن کە نوێژەکانیان دەفەوتاندو شوێنی ئارەزووەکان دەکەوتن ئنجا ئەمانە لەمەولا تووشی سزا یان شیوێکی دۆزەخ دەبن.

وە پێغەمبەریشﷺ دەفەرموێت: ((**بين الرجل وبين الكفر ترك الصلاة**))[٩٧]

واتە/ لەنێوان مرۆڤ و کوفردا وازهێنان لە نوێژ هەیە.

وە ((**العهد الذي بيننا وبينهم الصلاة فمن تركها فقد كفر**))[٩٨]

---

[٩٤] صحيح سنن الترمذي للألباني

[٩٥] الماعون/٤

[٩٦] مريم ٥٩

[٩٧] رواه مسلم عن جابر

[٩٨] احمد واهل السنن

واتە: ئەو پەیمانەی کە لەنێوان ئێمەو بێ باوەڕان دایە نوێژە ئنجـا هـەر کەسـێک وازی لـێ بێنێو نەیکات کافر دەبێت.

لەو کەسانەش کە خاوەنی ئەم بۆچوونەن ((عمـری کـوڕی **خطـاب**))، ((عبـدا لله ی کـوڕی مەسعود))، ((عبدا لله ی کوڕی عباس))، ((جابر کوڕی عبدا لله))و ((ابو درداء))و ((احمـدی کوڕی حەنبەل))و ((عبدا لله ی کوڕی مبارک))... هتد.

ب) کۆمەڵی دووەم بۆچوونیان وایە ئەو کەسەی نوێژ ناکات بـەڵام بـڕوای پـێی هەیـە ئـەوە پێی کافر نابێت و لەدین ناچێتە دەرەوە بەڵکو پـێی گوناهبـار دەبێت وە داوای تەوبـەکردن و پەشیمان بوونـەوەی لـێ دەکرێـت، ئەگـەر تەوبـەی نـەکرد ئـەوا دەسـتەڵات و فـەرمان ڕەوایـی ئیسلامی دەیکوژێت ((حداً)) ئەمەش بۆچوونی پێشەوا مالیک و شافیعی و... هتـد بـەڵام لای پێشەوا ابو حنیفه دەڵێت: دەبێ هەڕەشەی لێ بکرێت و زیندانی بکرێت تاوەکو نوێژ دەکات.

## * ئادابی نوێژکردن:

١) زۆر بە ئەدەبەوە بچێتە نـاو نوێژەکـەو لەبەردەسـتی پـەروەردگاری خۆیـدا بووەسـتێت و جموجۆڵ نەکات.

٢- جێ بەجێ کردنی نوێژەکان لەکاتی خۆیانداو دوا نەخستنیان.

٣) تەنها بۆ بەردەم خۆیو جێگای کڕنـووش بردنەکـەی بڕوانێـت، سـەیری ئاسمـان و دەورو پشتی خۆی نەکات.

٤) پێویستە هەوڵ بدات لەکاتی نوێژ کردندا ئەوەندە دەنگ بەرز بکاتەوە کـە تـەنها خـۆی گوێی لێ بێت و وە دەمیشی دانەخات و ووشەکان دەرببڕێت.

٥) پەلە نەکردن و لەسەرخۆیی لەهەموو ڕوکنەکانی نوێژەکەدا.

٦) دەست نوێژ تازە کردنەوە بۆ نوێژ لەکاتی تەنگەتاویدا.

٧) ئەنجام دانی نوێژەکەت لە شوێنێکی بێ دەنگ و ئارامدا.

٨) بەستنەوەی دڵ و مێشکت بە نوێژو واتاکەیەوە.

٩) دواخستنی نوێژ لەکاتی ئامادەبوونی خواردنـدا مەگـەر ترسـی بەسـەرچوونی کاتەکـەی هەبێت.

١٠) دیاری نەکردنی شوێنێکی تایبەت بۆ نوێژەکانی.

١١) دوای تەواو بوونی نوێژو سەلام دانەوە جێگاکەت بەجێ مەهێڵەو هەوڵ بدە ویردەکانی دوای نوێژ بخوێنی.

١٢) چاو نەنوقاندن لە نوێژدا بەبێ پێویست.

١٣) هەوڵ بدرێت هەمیشە لە نوێژدا بەر بەستێک (سترة) لەبەردەم خۆیدا دابنێت بۆ دیاری کردنی سنووری نوێژەکەی.

١٤) نوێژ نەکردن لەسەر گۆڕستان و بەرەو ڕووی گۆڕو ڕووبەڕووی ئاگر.

١٥) وابەستەبوون بە سوننەتی پێغەمبەرەوەﷺ لە چۆنیەتی نوێژ کردنداو دوورکەوتنەوە لە هەموو داهێنراوو (بدعة)یەک.

# وانەی دووەم:

# نـــوێـــــــــــژ ((الصلاة)) (٢)

## * ئەو شتانەی نوێژ بەتاڵ دەکەنەوە ((مبطلات الصلاة)):

١- خواردن و خواردنەوە بە ئەنقەست.

٢- قسەکردن بە ئەنقەست.

٣- وازهێنان و پشت گوێ خستنی روکنێکی نوێژ بە ئەنقەست و بەبێ بیانوی شەرعیو دروست وەکو نیەت گۆڕین و نەخوێندنی (فاتیحە)... هتد.

٤- ئەنجام دانی هەڵس و کەوتێکی زۆرو لەدوای یەک کە شێوازی نوێژەکە تێک بدات بەبێ هیچ بیانوویەکی شەرعی.

٥- پێکەنین و دەنگ بەرز کردنەوە لە نوێژدا بەڵام زەردەخەنە نوێژ بەتاڵ ناکاتەوە.

٦- جێ بەجێ نەکردنی یەکێک لە مەرجەکان (**شروط**)ی نوێژ بە ئەنقەست وەک بێ دەست نوێژ بوون یان خۆدانەپۆشین و ڕوونەکردنە قیبلە.

## * ئەو شتانەی ڕێگەی پێ دراوە لەناو نوێژدا ((ما يباح في الصلاة)):

١- جموجۆڵی کەم وەک خۆخوراندن یان ڕوانینی بەم لاو ئەولادا لەکاتی پێویست دا.

٢- بەرگری کردن لەو کەسەی دەیەوێت بە بەردەم نوێژەکەتدا بڕوات.

٣- کوشتنی مارو دووپشک یاخود دوور خستنەوەی ئەو شتانەی زیانت پێ دەگەیەنێت.

٤- ڕۆیشتن بە چەند هەنگاوێک لەکاتی پێویستدا.

٥- وتنی (سبحان ا للە) بۆ پیاوان وە چەپڵە لێدان بە پشتی دەست بۆ ئافرەتان لەکاتی پێویستیدا وەک ئاگادار کردنەوەی (إمام) کە سەهو بکات.

٦- دانانی پشتی دەست لەسەر دەم لەکاتی باوێشک داندا.

٧- ((التنحنح)) واتە (ئح ئح) کردن لە نوێژدا بۆ کاتی پێویست.

## * ئەو کاتانەی کە نوێژکردن تیایاندا باش نیە ((الأوقات التي يكره فيها الصلاة)):

١- دوای نوێژی بەیانی تا خۆر بە ئەندازەی ڕمێک بەرز دەبێتەوە.

٢- لە کاتێکدا خۆر لە ناوەڕاستی ئاسماندایە تا لادەدات و نوێژی نیوەڕۆ دەبێت.

٣- دوای نوێژی عەسر تا خۆر ئاوابوون وەک پێغەمبەری خواﷺ لەم بارەوە فەرموویەتی:

((ثلاث ساعات كان رسول اللهﷺ ينهانا ان نصلي فيهن، أو ان نقبر فيهن موتانا، حين تطلع الشمس بازغة حتى ترتفع وحين يقوم قائم الظهيرة حتى تميل الشمس وحين تضيف الشمس للغروب))[٩٩]

وە هەروەها دەفەرموێت: ((لا صلاة بعد صلاة العصر حتى تغرب الشمس ولا صلاة بعد صلاة الفجر حتى تطلع الشمس))[١]

تێ بینی: مەبەست بەو کاتانە کە نوێژ تێیاندا باش نیە تایبەتە بەو نوێژە سوننەتانەوە کە هۆکاری نیە. وەک سوننەتی ڕووت (مطلق) بەڵام سوننەتێکی وەک ((تحية المسجد)) یان سوننەتی دەست نوێژ لەو کاتانەشدا مکروهـ نیە.

## * کڕنووش بردنی لێ تێک چوون ((سجدة السهو)):

بریتیە لەو دوو سەجدەیەی دەبرێت دوای تەحیاتی کۆتایی لەپێش یان لەپاش سەلام دانەوە ئەگەر لەناو نوێژەکەدا لێی تێک چوو یان سەهوی کرد، بەهۆی ئەمانەوە:

١- ئەنجام دانی ڕوکنێکی زیادە لە نوێژدا بە سەهوو.

٢- کەم کردنەوەی ڕوکنێک لە نوێژ بە سەهوو.

٣- دروست بوونی گومان لە کردن و نەکردنی ڕوکنێک دا بەم شێوەیەی خوارەوە:

---

[٩٩] رواه مسلم.

رواه البخاري ومسلم

أ- ئەگەر ڕوكنێكی لەبیر چوو وەبیری نەكەوتەوە تا گەیشتەوە هەمان ڕوكن لە ڕكاتێكی دیكەدا ئەوا ئەو ڕكاتەی سەهوەكەی تێدا كردووە وازی لێ دەهێنێو ئەم ڕكاتەی دیكە لەجیاتی ئەودا لە پاشاندا سوجدەی سەهوو دەبات دوای سەلام دانەوە.

خۆ ئەگەر پێش ئەوەی بگاتەوە هەمان ڕووكن بیری كەوتەوە دەبێت بگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕووكنەی كە لەبیری چووەو لەو شوێنە وەدەست پێ بكاتەوە لە پاشاندا دوای سەلام دانەوە سوجدەی سەهوو دەبات.

ب- ئەگەر نوێژخوێن تەحیاتی یەكەمی لەبیر چوو بەڵام پێش ئەوەی هەڵبستێتەوە بیری كەوتەوە ئەوا پێویست بە سوجدەی سەهوو ناكات، بەڵام ئەگەر تەحیاتی لەبیر چوو وە لەكاتی بەرز بوونەوە بۆ ڕكعاتی سێیەم بیری كەوتەوە پێش ئەوەی بە تەواوی ڕاست بێتەوە ئەوا دەبێت بگەڕێتەوە بۆ تەحیاتەكەیو دوایش سوجدەی سەهوو دەبات دوای سەلام دانەوە. بەڵام ئەگەر بیری نەكەوتەوە تا بە تەواوی ڕاست بۆوە بۆ ڕكعاتی سێیەم ئەوا تازە نابێت بگەڕێتەوە بۆ خوێندنی ئەو تەحیاتە بەڵام دەبێت دوایی سوجدەی سەهوو بەرێت پێش سەلام دانەوە.

جـ- ئەگەر نوێژخوێن كەوتە گومان لە نوێژەكەیدا دەبێت هەوڵ بدات دڵی خۆی ساغ بكاتەوە بەلایەكدا. ئینجا ئەگەر دڵی ساغ بۆوە بەلایەكدا ئەوا لەسەر ئەوەوە نوێژەكەی تەواو دەكات و لە دوایدا سوجدەی سەهوو دەبات دوای سەلام دانەوە، بەڵام ئەگەر هەر دوودڵ بوو، ئەوا دەبێت لا كەمەكەی دابنێت و نوێژەكەی لەدوای ئەوەوە تەواو بكات وە دوایی سوجدەی سەهوو ببات پێش سەلام دانەوە.

د- ئەگەر كەسێك ڕكاتی زیادەی كرد لە نوێژدا سوجدەی سەهوو دەبات دوای سەلام دانەوە.

هـ- ئەگەر كەسێك بە سەهوو سەلامی دایەوە پێش تەواو كردنی نوێژەكەی ئەوە ئەگەر ماوەیەكی زۆری خایاند نوێژەكەی دووبارە دەكاتەوە بەڵام ئەگەر ماوەیەكی كەمی خایاند بە ئەندازەی چەند دەقیقەیەك ئەوا دەگەڕێتەوە سەر نوێژەكەیو تەواوی دەكات، ئینجا دوای سەلام دانەوە سوجدەی سەهوو دەبات.

بەڵگەش بۆ ئەمانەی پێشەوە:

**١- عن عبدا لله بن مسعود (رضي ا لله عنه) ان رسول ا لله ﷺ: صلى الظهر خمساً فقيل له أزيد في الصلاة؟ فقال وما ذاك؟ قال صليت خمساً. فسجد سجدتين بعد ما سلّم))**[١٠١]

واته/ جاريكيان پێغەمبەر ﷺ نوێژی نیوەڕۆی پێنج ڕکات کرد، پێیان گوت ئایا نوێژ زیاد کراوە؟ فەرمووی بۆچی بووە؟ گوتیان پینج ڕکاتت کرد، ئەویش دوو سوجدەی برد دوای سەلام دانەوە.

**٢- عن عبدا لله بن عيينة (رضي ا لله عنه) انه قال: ان رسول ا لله ﷺ: قام من اثنتين من الظهر لم يجلس بينهما فلما قضى صلاته سجد سجدتين ثم سلم بعد ذلك))**[١٠٢]

**٣- ((عن عبدا لله بن مسعود (رضي ا لله عنه) ان رسول ا لله ﷺ قال: ((واذا شكّ أحدكم في صلاته فليتحر الصواب فليتم عليه ثم ليسلم ثم يسجد سجدتين))**[١٠٣]

واته/ هەر کاتێک یەکێکتان کەوتە گومانەوە لە نوێژەکەیدا با بەدوای ڕاستیەکەیدا بگەڕێت و ئنجا لەسەر ڕاستیەکە نوێژەکەی تەواو بکات و پاشان با سەلام بداتەوەو پاشان دوو سووجدە دەبات.

---

[١٠١] اخرجه البخاري ومسلم.

اخرجه البخاري ومسلم (٩٢-٣).

[١٠٣] اخرجه البخاري ومسلم.

# وانەی سێهەم:

# نــوێـــــــژ (الصلاة) (١)

## * نوێژی بەکۆمەڵ ((صلاة الجماعة)):

نوێژی بەکۆمەڵ سوننەتێکی گەورەیە تەنانەت هەندێ لە زانایان دەڵێن واجبە، هەر لەبەر گرنگیو گەورەیی نوێژی بەکۆمەڵە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: ((**تفضل صلاة الجميع صلاة احدكم وحده بخمسة وعشرين جزءاً وتجتمع ملائكة الليل وملائكة النهار في صلاة الفجر**))[١٠٤]

واتە/ نوێژی بەکۆمەڵ چاکترە لە نوێژی هەر کامێکتان بە تەنها بە (٢٥) ئەوەندە زیاتر، وە فریشتەکانی شەوو فریشتەکانی رۆژ هەردووکیان کۆ دەبنەوە لەکاتی نوێژی بەیانیدا.

هەروەها دەفەرموێت: ((**صلاة الجماعة تفضل صلاة الفذ بسبع وعشرين درجة**))[١٠٥]

واتە/ نوێژی بەکۆمەڵ گەورەترو چاکترە لە نوێژی بەتەنهایی بە (٢٧) پلە.

## * چۆنیەتی نوێژی بەکۆمەڵ:

نوێژی بەکۆمەڵ بە دوو کەسیش دادەمەزرێت بەڵام تا ژمارەی نوێژکەران زیاتر بێت پاداشتیان زیاتر دەبێت وەک پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((**صلاة الرجل مع الرجل أزكى من صلاته وحده، وصلاته مع الرجلين أزكى من صلاته مع الرجل وما كان أكثر فهو أحسن الى الله تعالى**))[١٠٦]

واتە/ نوێژی پیاو لەگەڵ پیاوێکی تردا خێری زیاترە لە نوێژی پیاوێک بەتەنها بێت، وە

---

[١٠٤] رواه البخاري ومسلم.

[١٠٥] رواه البخاري ومسلم.

[١٠٦] رواه احمد وابو داود والنسائي وصححه ابن السكن والحاكم.

نوێژی لەگەڵ دوو پیاودا پاداشتی زیاترە تا لەگەڵ یەک پیاو، وە تا ژمارەیان زیاتر بێت خوای گەورە زیاتری پێ خۆشە.

وە هەروەها نوێژی بەکۆمەڵ لە مزگەوتدا خێرو پاداشتی زیاترە وەک لە دەرەوەی مزگەوت وەتا مزگەوتەکە دوورتر بێت پاداشتی زیاترە، هەروەک پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێت: **((اعظم الناس اجراً في الصلاة ابعدهم فابعدهم فمشيً والذي ينتظر الصلاة حتى يصليها مع الامام اعظم اجراً من الذي يصلي ثم ينام))**[107]

واتە/ گەورەترین پاداشتی نوێژ بۆ ئەو کەسانەیە کە لە دوورترین شوێنەوە دێن بۆ مزگەوت و ئەو کەسانەی کە زۆرتر هەنگاو دەنێن بەرەو مزگەوت وە ئەو کەسەی کە چاوەڕێی نوێژی داهاتوو دەکات تاوەکو لەگەڵ ئیمامدا نوێژەکەی بکات ئەوە پاداشتی زیاترە لەو کەسەی کە نوێژ بەتەنها دەکات و چاوەڕێی نوێژی بەکۆمەڵ ناکات پاشان دەخەوێت.

## * هەندێک لە مەرجەکانی پێشەوای نوێژ ((شروط الإمام)):

١- شایستەترین کەس بە ئیمامەتی ئەو کەسەیە کە کە زیاتر قورئان زان و خوێندەوارو شارەزابێت پێی وەزیاتر شارەزای فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا بێتﷺ.

٢- پێویستە نێرینە پێش نوێژی بکات بۆ پیاوان و ئافرەتان بەڵام دروست نییە ئافرەت پێش نوێژی پیاوان بکات تەنها بۆ خۆیان نەبێت.

٣- ئەو کەسەی کە پێش نوێژی دەکات نابێت کەسێک بێت نوێژکەران ڕقیان لێ بێت و پێی ڕازی نەبن، هەروەک پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێت: **((ثلاثة لا ترتفع صلاتهم فوق رؤوسهم شبراً: رجل أمّ قوماً وهم له كارهون وامراءة باتت وزوجها عليها ساخط واخوان متصارمان))**[108]

واتە/ سێ کەس نوێژەکەیان بستێک لەسەر سەریانەوە بەرز نابێتەوە: پیاوێک ئیمامەتی قەومێک بکات و ئەوانیش ڕقیان لێی بێت، ئافرەتێک شەو بکاتەوەو مێردەکەشی لەسەری

---

[107] رواه البخاري ومسلم.

[108] رواه ابن ماجة.

لێی توەڕە بێ، وە دوو برا کە ڕق بەرقیان بێت.

## نوێژە سوننەتەکان (الصلوات المسنونة)):

* یەکەم/ الرواتب:

کە بریتین لەو نوێژە سوننەتانەی کە لەپێش یان لەپاش نوێژە فەرزەکانەوە دەکرێن وە دەبنە دوو بەشەوە.

١) **مؤكدة/** واتە ئەو سوننەتانەی کە پێغەمبەرﷺ بەردەوام بووە لەسەر کردنیان کە بریتین لە:

أ- ٢ ڕکات پێش نوێژی نیوەڕۆ

ب- ٢ ڕکات لەدوای نوێژی نیوەڕۆ.

ج-٢ ڕکات لەدوای نوێژی شێوان (المغرب) لە ماڵەوە.

د- ٢ ڕکات لەدوای نوێژی خەوتنان (العشاء) لە ماڵەوە.

هـ- ٢ ڕکات لەپێش نوێژی بەیانی.

هەروەکو عبداللەی کوڕی عمر دەفەرموێت **((حفظت من النبيﷺ عشر ركعات: ركعتين قبل الظهر وركعتين بعدها وركعتين بعد المغرب في بيته وركعتين بعد العشاء في بيته وركعتين قبل صلاة الصبح))**[109]

وە لە هەندێک ڕیوایەتی تردا هاتووە کە سوننەتە چوار ڕکات نوێژ بکرێت لەپێش وە لە پاش نوێژی نیوەڕۆ.

٢) **غير مؤكدة/** کە بریتین لەو سوننەتانەی کە پێغەمبەرﷺ بە بەردەوامی نەی کردوون کە بریتین لەمانە:

أ- ٢ ڕکات یان ٤ ڕکات پێش عەسر.

ب- ٢ ڕکات پێش نوێژی شێوان (مغرب).

ج- ٢ ڕکات پێش نوێژی خەوتنان (عشاء)ەوە.

---

رواه البخاري.

هەروەکو پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: ((بين كل أذانين صلاة وبين كل أذانين صلاة ثم قال في الثالثة لمن يشاء))[110]

* دووەم/ الوتر: بریتیيە لەو نوێژە سوننەتەی کە لە شەودا لەدوای نوێژە سوننەتەکانی شەودا دەکرێن لەدوای نوێژی خەوتنانەوە (عشاء).

کە ژمارەی ڕکاتەکان (١ یان ٣ یان ٥ یان ٧ یان ٩ یان ١١ یان ١٣) هەروەها پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: ((اجعلوا آخر صلاتكم بالليل وتراً))[111]

* سێیەم/ شەو نوێژ.

* چوارەم/ نوێژی چێشتەنگاو ((الضحى)).

* پێنجەم/ نوێژی تەراویح.

* شەشەم/ نوێژی ئیستخارە ((استخارة)).

* حەوتەم/ نوێژی پێویستی ((الحاجة)).

وە هەندێکی تر لەو نوێژانە وەک سوننەتی چوونە مزگەوت و سوننەتی گەڕانەوە لە سەفەرو کردنی لە مزگەوتدا وە سوننەتی تەوبەو سوننەتی مانگ گیران و ڕۆژگیران و داواکردنی باران بارین و نوێژی جەژنەکان (ڕەمەزان و قوربان)..... هتد.

---

[110] رواه الجماعة من حديث عبدالله بن مغفل.

[111] رواه الأربعة.

# وانەی چوارەم:

# ڕۆژوو ((الصیام)) (١)

مانگی ڕەمەزان مانگێکی جیاوازە لە هەموو مانگەکانی تر مانگێکە تێیدا قورئان هاتوەتە خوارەوە، تێیدا شەیتانەکان بواری گوناهبارکردنی خەڵکیان لێ تەسک دەکرێتەوە، زۆر مەلائیکەت تایبەت دەکرێن بە پاڕانەوەو دوعاکردن بۆ ڕۆژوەوان، تێیدا بواری عیبادەت فراوان دەبێت وەک (ئیعتکاف کردن، قورئان خوێندن، بەخشین، جیهاد کردن، دەرس خوێندن) تێیدا مرۆڤ ڕۆحی سووک دەبێت و نەفسی پاک دەبێتەوە هەست بە دڵخۆشیو بەرەو کەماڵ چوونێک دەکات و تێیدا خەڵکی نوێ موسڵمان زۆر دەبێت...

ڕەمەزان ڕێگەیەکە بۆ کردنەوەی دەرگای (تەقوا).. ڕەمەزان قوتابخانەیەکە بۆ تەمبێ کردنی نەفسو جەستە، جەستە لە خواردن و خواردنەوەو کاری زایەندی، نەفس لە ئارەزووە غەریزەییەکانی وەک (خودپەسەندیو شەڕکردن لەسەر زات، غەریزەی جنس، غەریزەی خواردن و خواردنەوە، غەیبەت کردن و خۆدەرخستن، خۆگرتن و نەخزان بەرەو (مەئلوفات)، قەڵایی کردنەوەی دڵ بە خۆشویستنی خواو جێ پێ هەڵگرتنی پێغەمبەرﷺو مەیلی بەهەشت و ڕەزامەندی ئەو پەروەردگارە پڕ سۆزە.

زۆر بەکورتی باس لە هەندێ (ئەحکام) دەکەین کە تایبەتە بە ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانەوە:

**١- پێناسەی ڕۆژوو:** (وشەی (صام) لە زمانی عەرەبیدا یانی توخن نەکەوتنەوەو وازهێنان لە شتێک، خوا دەفەرموێت لەسەر زمانی (مەریەمی دایکی عیسا) ﴿**انی نذرت للرحمن صوماً**﴾واتە/ من بڕیارم داوە توخنی قسە نەکەومەوەو ئەمڕۆ واز لە قسە کردن بهێنم... بەڵام لە شەرعدا (صوم) یانی واز هێنان لە خواردن و خواردنەوەو ئاوی خۆهێنانەوەو

خۆرشاندنەوە لە بەرەبەیانەوە تا خۆر ئاوابوون بە نییەتی عیبادەت کردن بۆ خوا[112]

**٢- حوکمی ڕۆژوو:** واجبە لەسەر هەموو موسڵمانێکی بالغی عاقڵ کە لەتوانایدا هەبێت، نیشتەجێ بێت و لە سەفەردا نەبێت، بۆ ئافرەت ئەبێت لە حەیزو زەیسانیشیدا نەبێت.

ئەمەش بە (کتاب)و (سنة)و (اجماع) فەرز بووە.

خوا دەفەرموێت: ﴿**كتب عليكم الصيام**﴾ یانی فەرز کراوە لەسەرتان ڕۆژوو گرتن.

لە فەرموودەی ئیمامی (بخاری دا) هاتووە: کابرایەک هاتە لای پێغەمبەرﷺو وتی: **أخبرني ما فرض الله علي من الصيام؟** پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (**شهر رمضان الا ان تطوع شيئاً**)[113] هەموو میللەتی گەورەی ئیسلامیش لەهەرسێ چەرخە شایەتی بۆ دراوە کە تا ئێستا کۆن لەسەر ئەوەی ڕۆژووی ڕەمەزان واجبەو هەرکەس ئینکاری بکات کافر دەبێت و لە بازنەی ئیسلام و (دین) دەچێتە دەرەوە[114]

**٣- فەرزو کۆڵەکەکانی ڕۆژوو:** ڕۆژوو دوو کۆڵەکەی گەورەی هەیە:

یەکەمیان/ نییەت.

دووەمیان/ وازهێنان و توخن نەکەوتنەوە لەو شتانەی ڕۆژوو دەشکێنێت.

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: ((**من لم يجمع الصيام قبل الفجر فلا صيام له**))[115]

واتە/ هەرکەسێک ڕۆژووەکەی لەپێش بەرەبەیانەوە نەبێ لیّی وەرناگیرێ.

خوای گەورە (جل جلاله) دەفەرموێت: ﴿**احل لكم ليلة الصيام الرفث الى نسائكم هن لباس لكم وأنتم لباس لهن علم الله أنكم كنتم تختانون أنفسكم فتاب عليكم وعفا عنكم فالآن باشروهن وابتغوا ما كتب الله لكم وكلوا واشربوا حتى يتبين لكم الخيط الابيض من**

---

(ابن حجر)/ فتح الباري/٤/٨١.

فتح الباري كتاب الصيام باب وجوب صوم رمضان (٤ ٨٢).

(فقه السنة ١/٣٦٦).

رواه احمد واصحاب السنن وصححه ابن خزيمة وابن حبان دافع عن صحته النووي في المجموع.

**الخيط الاسود من الفجر ثم اتموا الصيام الى الليل﴾**[١١٦]

## ٤- سوننه ته کانی رۆژوو:

أ- پارشێو کردن: ئه‌گه‌ر به‌یه‌ك قوم ئاویش بێت... پێغه‌مبه‌رﷺ ده‌فه‌رموێت: **((تسحروا فان في السحور بركة))**[١١٧]

ئیبن حه‌جه‌ر ده‌فه‌رموێت: ((ئه‌م به‌ره‌که‌ته زۆر شت ده‌گرێته‌وه له‌وانه: زیندوو کردنه‌وه‌ی سوننه‌تێك، دژایه‌تی کردنی گاورو جووله‌که، گورێکی چاکیش بۆ عیباده‌ت، زیاده وزه‌یه‌ك بۆ چالاکیو جموجۆڵ، بێوه‌ی بوون له خولق خراپی له‌کاتی زۆر برسێتی دا، مایه‌ی به‌خشنده‌یی بوونه (جا ئیتر داوای بکرێت یان له‌گه‌ڵیدا نان بخورێت)، مایه‌ی (سه‌حه‌ر)و زیندوو کردنه‌وه‌ی به‌ره‌به‌یانه که کاتی دوعاکردن و زیکر کردنه، فریای نیه‌ت هێنان ده‌که‌وێت ئه‌گه‌ر پێش نوستن بیری نه‌بووبێت[١١٨]

ئه‌گه‌ر گومانی په‌یدا کرد رۆژ بۆته‌وه یان نا، بۆی هه‌یه بخوات و بخواته‌وه تا یه‌قین په‌یدا ده‌کات، ئیمامی (نه‌وه‌وی) ده‌فه‌رموێت: **(وقد اتفق اصحاب الشافعي على جواز الاكل والشرب للشك من طلوع الفجر)**[١١٩]

ب- خێرا رۆژوو شکاندن:

به خورما ئه‌گه‌ر هه‌بوو ئه‌گه‌رنا به‌ئاو.. ئه‌نه‌سی کوری مالیك ده‌ڵێت: **كان رسول اللهﷺ يفطر على رطبات قبل ان يصلي، فان لم تكن فعلى تمرات، فان لم تكن حسّ حسوات من ماء)**[١٢٠]

حسا: واته/ خواردنه‌وه. له په‌سه‌ند دادانی صه‌حابه‌دا هاتووه که **(كان اصحاب محمدﷺ**

---

[١١٦] البقرة/١٨٧

[١١٧] رواه البخاري.

[١١٨] فتح الباري ٤/١١٢

[١١٩] فقه السنة ١/٣٨٦

[١٢٠] رواه ابو داود والحاكم وصححه والترمذي وحسنه

**اسرع الناس افطاراً وابطأهم سحوراً)**[121]

واتە/ هاوەڵانی پێغەمبەر لە هەموو کەس زیاتر پەلەیان دەکرد لە ڕۆژوو شکاندن و درەنگ پارشێویان دەکرد.

جـ- زۆر دوعا کردن لە ڕۆژو شەودا:

بەتایبەتی کاتی ڕۆژوو شکاندن و کاتی ڕۆژوو گرتن لە (سحور)دا. پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: **(ثلاثة لا ترد دعوتهم: الصائم حتى يفطر، الامام العادل، والمظلوم)**[122]

- لەبەر ئەوەی ڕۆژوو دوو پەیوەندی بە ڕۆژووەوانەوە هەیە: پەیوەندییەک بە دەرەوەو جەستەی ڕۆژوەوانەوە، پەیوەندییەک بە دڵ و ناوەوەی ڕۆژوەوانەکەوە.

پێویستە لەسەر ڕۆژوەوان ڕەچاوی ئادابی (دیارو نادیار -**ظاهر وباطن**)ی خۆی بکات، تا نە ڕۆژووەکەی بشکێت و هیچ ئەجری نەمێنێت و گوناهباریش بێت، نە ڕۆژووەکەشی کەم بکات و تووشی گوناهی وا ببێت تەنها برسێتیو تینویەتییەکەی بۆ بمێنێتەوە.

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: **(ليس الصيام من الاكل والشرب، انما الصيام من اللغو، والرفث، فان سابك احد أو جهل عليك، فقل اني صائم، اني صائم)**[123]

دوورکەوتنەوە لە قسەی خراپ و درۆو قسەکردن بە زۆریو چاوبازیو غەیبەت کردن، دوو زەرەر دەدات لە ڕۆژووەوان، زەرەرێک لە خودی ڕۆژوەکەو ئەجر لەسەری کەم دەکاتەوە ئەگەر هەمووی بەبا نەدات زەرەرێک لە کاریگەری ڕۆژووەکە بەوەی (تەقوا) دروست نابێت و کابرای ڕۆژووەوان ئەو ڕۆژووانەی هەروا بەسەردا دەگوزەرێت.

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: **(رب صائم ليس من صيامه الا الجوع، ورب قائم ليس له من قيامه الا السهر)**[124]

واتە/ زۆر ڕۆژووگر هەیە بەشی لە ڕۆژووەکەی تەنها برسێتییە، وە زۆر کەس بەشی لە ڕاوەستان و نوێژی شەو تەنها ماندووبوونە.

---

[121] فتح الباري (٤/١٦١).

رواه الترمذي بسند حسن قاله (فقه السنة ١/٣١٧).

[123] رواه الحاكم وقال صحيح على شرط مسلم.

رواه الحاكم وقال صحيح على شرط البخاري.

د- <u>ئیعتیکاف کردن:</u>

ئیعتیکاف واته/ وابەستەبوون بە شتێکەوەو دوور نەکەوتنەوە لێی خوا دەفەرموێت ﴿**ما هذه التماثيل التي انتم لها عاكفون**﴾الأنبياء/٥١. بەڵام لە شەرعدا ئیعتیکاف یانی: وابەستەبوون و جێ نەهێشتنی مزگەوت بۆ ماوەیەک و مانەوە تێیدا بە نیەتی خواپەرستی کردن.. ئیعتیکاف کردن سوننەتێکی (مونەکەدە)ی گەورەی پێغەمبەرە ﷺ بە تایبەتی لە ڕەمەزانداو بە تایبەت تریش لە ( ١ ) شەوو ڕۆژی کۆتاییدا.

**مەرجەکانی ئیعتیکاف سیانن:**

١- نیەت بهێنی بۆ ماوەیەک کەم یان زۆر لە مزگەوتدا بمێنێتەوە بۆ خواپەرستی.

٢- تەنیا لە مزگەوتدا دەبێت نەک ماڵ یان مزگەوتی ماڵ.. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿**وانتم عاكفون في المساجد**﴾البقرة/١٨٧

٣- مانەوەو جێ نەهێشتنی مزگەوت لەو ماوەیەدا بۆ شتی زۆر زەروور نەبێت و ئەویش زۆر نەخایەنێت.

وەک/ ((خۆ شۆردن، نان خواردن، ئەسپەردە کردنی مردوویەک، سەر ئاوکردن..)).

ئیمامی عەلی دەفەرموێت: (کەسێک ئەگەر ئیعتیکافی کرد بۆی هەیە بچێت بۆ جومعەکردن و سپاردنی مردوو و سەردانی نەخۆش و بچێتەوە ماڵەوە داوای پێویستی خۆی بکات و بگەڕێتەوە.

ئیمامی بوخاری لە دایکمان (**صفية**)ەوە دەگێڕێتەوە دەڵێت: شەوێکیان **صفيه** سەردانی پێغەمبەر ﷺی کرد لە مزگەوتدا کە ئیعتیکافی تێدا دەکرد، چەند سەعاتێک لای مایەوەو پاشان پێغەمبەری خوا ڕەوانەی کردەوە تا ماڵ، کاتێک گەیشتنە بەر دەرگای (ئوم سەلەمە) دوو پیاوی ئەنصای دایان بەلایانداو سلاویان لە پێغەمبەر ﷺ کردو بە پەلە گوزەریان کرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:(**على رسلكما، انما هي صفية بنت حيي**).. ووتیان: سبحان الله پێغەمبەری خوا -زۆر ناڕەحەت بوون، پێغەمبەر فەرمووی: (**ان الشيطان يبلغ من الانسان مبلغ الدم واني خشيت ان يقذف في قلوبكما شيئاً**)[١٢٤]

---

جواهر البخاري. ج/٢٣٩ ص١٩٠

# وانەی پێنجەم:

# ڕۆژوو ((الصیام)) (٢)

## ٥- ئەو شتانەی ڕۆژوو دەشكێنن:

ئەو شتانەی ڕۆژوو دەشكێنن دوو بەشن:

أ- ڕۆژووەكە دەشكێنن و قەزای دەكەوێتە سەر.

ب- ڕۆژووەكە دەشكێنن و قەزاو كەفارەتیشی دەكەوێتە سەر.

* بەشەكانی خاڵی یەكەم ئەمانەن:

(أ، ب) خواردن و خواردنەوە بە ویستی خۆی و بێ لەبیر چوونەوە، خۆ ئەگەر لەبیری چوو، یان بە هەڵەیاخود بەزۆری زۆردارێك خواردن و خواردنەوەی خواردەوە ئەوە ڕۆژووەكەی ناشكێنێت پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: **(من نسي -وهو صائم- فأكل وشرب فليتم صومه، فانما اطعمه ا لله وسقاه)**[١٢٦]

ج) خۆڕشاندنەوە بەزۆر، خۆ ئەگەر ڕشانەوە زۆری بۆ هێنا، ڕۆژووەكەی ناشكێت/ پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: **((من ذرعه القيء فليس عليه قضاء، ومن استقاء عمداً فليقض))**[١٢٧]

(د، هـ) حەیزو منداڵ بوون و زەیستانی.. (ئەگەر یەك ساتە وەختێش بێت).

و) ئاوی خۆهێنانەوە (بەهەر هۆكارێك بێت -بەدەست یان یاری كردن لەگەڵ ژنەكەی دا-

* بەشەكانی خاڵی دووەم تەنیا جیماع كردنەو بەس.. كەفارەتەكەش بەم تەرتیبەیە:

١- ڕزگاركردنی عەبدێك.

٢- ئەگەر نەبوو دوو مانگ لەسەریەك و بێ شكاندنی هیچ ڕۆژێك ڕۆژوو بگرێت.

---

١٢٦ رواه الجماعة.

١٢٧ رواه الحاكم وصححه.

٣- ئەگەر نەیتوانی خواردنی (٦٠) شەست ژەمی هەژار بدات.

## ٦- ئەو شتانەی رۆژوو ناشکێنێنن و حەلاڵن:

أ- خۆ شۆردن و مەلەکردن، (بخاري و مسلم) لە عائشەوە دەگێڕنەوە کە گوتوویەتی: (**ان النبي ﷺ يصبح جنباً، وهو صائم ثم يغتسل**).

ب- چاورشتن و قەترەی چاو، ئیدی تامەکەی بچێتە دەم یان نا، چونکە چاوکون نییە بۆ ناو دەم.

ج- ماچ کردنی خێزان، هەر چی شوێنێکی بێت، جیاوازیش نییە لەنێوان گەنج و پیردا مەگەر لە خۆیان بترسن.. دایکمان عائشە دەفەرموێت: ((**كان النبي ﷺ يقبل وهو صائم، ويباشر وهو صائم، وكان أملككم لإربِهِ**)).. عائشە گەنجێک بوو، پێغەمبەریش ﷺ بە تەمەنێک بوو لەو کاتەدا..

د- هۆقنەو دەرزی لەخۆدان ئیدی بە کۆم بێت یان بە دەمار یان بەژێر پێست، جیا بشگاتە لەش و ناوەوەی مرۆڤ، چونکە (مەنفەزی سروشتی خواردن و خواردنەوەی نییە)[128]

هـ- کەلەشاخ گرتن یان خوێن دان و خوێن وەرگرتن.. ئیمامی بوخاری دەڵێت: (**احتجم النبي ﷺ وهو صائم**)، هەر کەس بڵێت باشە خۆ لە فەرموودەکەدا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت (**افطر الحاجم والمحجوم**)[129]

ئەڵێین هەموو رێگاکانی ئەو فەرموودەیە (**ضعيف**)ن و نابنە (**حجة**).. ئەگەر لە (**ضعف**)ەکەش رزگاری ببێت و بچێتە پلەی (حسن) یان (**صحيح**)، رووخسەت بەدوایدا هاتووە چونکە حەدیسی پێشوو لە (**حجة الوداع**)دا گوتراوە[130]

و- هەموو ئەو شتانەی کە لە دەسەلاتتدا نییە خۆتی لێ بپارێزیت. وەک: تف قوت دان تۆزی رێگە، بۆنی خۆش، تۆزی ئارد، بەلغەم.. هەروەها ئیمامی بوخاری دەفەرموێت: ((باب

---

[128] فقه السنة (١/ ٣٩٠)

[129] رواه البيهقي وابو داود واحمد والنسائي والترمذي.

[130] فتح الباري (٤/ ١٤٣،١٤٤،١٤٥).

قول النبيﷺ: اذا توضأ فليستنشق بمنخره الماء، ولم يميز بين الصائم وغيره، وقال الحسن لا بأس بالسعوط* ، للصائم، ان لم يصل الى حلقه ويكتمل وقال عطاء ان تمضمض ثم افرغ ما في فيه من الماء لا يضره ان لم يزدرد ريقه وماذا بقي في فيه ولا يمضع العلك فان ازدرد ريق العلك لا اقول انه يفطر ولكن ينهى عنه))[131]

شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە دەفەرموێت: (وشم الروائح الطيبة لا بأس به للصائم... وكذلك الاكتحال والتبخر والادهان وان تقوى به البدن وشربه البشرة...)[132]

ز- واجب نییە پەیدا کردنی یەقین بۆ خۆرئاوابوون یان رۆژبوونەوە بەڵکو لە هەردووکیاندا پەلەکردن سوننەتە..

ئیمامی بوخاری بە ئیسنادی خۆی لە سهلی کوڕی سعدەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی (لا يزال الناس بخير ما عجلوا الفطر)[133]

ئیبن حەجەری عەسقەلانیش دەفەرموێت:

(ومن البدع المنكرة ما احدث في هذا الزمان... لا يؤذنون الا بعد غروب الشمس بدرجة لتمكين الوقت زعموا فأخروا الفطر وعجلوا السحور وخالفوا السنة فلذلك قل عنهم الخير وكثر فيهم الشر وا لله المستعان)[134]

ئیمامی بوخاری بە سەنەدی خۆی لە ئەسمائی کچی ابوبکرەوە دەگێڕێتەوە کە ئەسماء گوتوویەتی: (افطرنا على عهد النبيﷺ يوم غيم ثم طلعت الشمس وقال معمر سمعت هشاماً لا أدري اقضوا أم لا)[135]

ئیبن حجر لە (ابن المنير)ەوە نەقڵ ئەکات کە فەرموویەتی (في هذا الحديث ان المكلفين انما خوطبوا بالظاهر فاذا اجتهدوا فاخطئوا فلا حرج عليهم في ذلك)[136]

* السعوط: واته: دەرمان کردنە لووت (فقه السنة ج/١ ص٣٩٠).

[131] فتح الباري (١٢٩/٤).

[132] فقه السنة بتصرف (٣٩١/٤).

[133] (٩٠٣). رواه البخاري عن سهل بن سعد

[134] فتح الباري بشرح صحيح البخاري (١٦١/٤).

[135] فتح الباري (١٦٢/٤).

[136] فتح الباري/٤/١٦٢

شێخی ئیسلام ئیبنی تەیمیەش لە ڕاڤەی ئەم فەرموودەیەدا دەفەرموێت:

**(هذا يدل على شيئين: الاول: انه لا يحسب مع الغيم التأخير الى ان يتيقن الغروب فانهم لم يفعلوا ذلك ولم يأمرهم النبيﷺ به).**

**الثاني: يدل على انه لا يجب القضاء، فان النبيﷺ لو أمرهم بالقضاء لشاع كما نقل فطرهم، فلما لم ينقل دل على انه ام يأمرهم به)**[137]

لە (**الاختيارات العلمية**)دا لە كتێبی (**مجموعة الفتاوى ٤/٦٤**)دا دەفەرموێت:

**(ومن أكل في شهر رمضان معتقداً انه ليل فبات نهاراً فلا قضاء عليه، وكذا من جامع جاهلاً بالرفث او ناسياً).**

ح) نیەت هێنان لە شەودا بێت چاكترە خۆ ئەگەر كەوتە ڕۆژیش تا پێش نیوەڕۆ هەر دروستە...

ئیمامی مسلم بە سەنەدی خۆی لە عائیشەوە دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: **(قال لي رسول اللهﷺ ذات يوم: يا عائشة هل عندكم شيء قالت فقلت، يا رسول الله ما عندنا شيء. قال فأني صائم)**[138]

جیاوازی نیە لەنێوان (ڕۆژووی فەرزو سوننەتدا وەك دەگوترێت ئیبنی حەجەر لە وەڵامی ئەو كەسانەدا كە دەڵێن: لەوانەیە پێغەمبەرﷺ هەر لە شەودا نیەتی هێنا بێت بۆیە فەرموویەتی ما دامێك هیچ نیە، بیخۆین كەواتە من بەڕۆژووم دەفەرموێت: **(وهو تأويل فاسد وتكلف بعيد)** هەروەها هەر بەم عیبارەتەش نەوەوی لە (**ارشاد الساري ٥/١٤٠**)دا ئەمە دەفەرموێت.

بەڵكو ئیمامی ئەحمەد دەفەرموێت **(يجزئه نية واحدة لجميع الشهر)** كە ئەمە قسەی ئیمامی مالیك و ئیسحاقیشە)[139]. والله اعلم.

---

هـ. (فقه السنة ١).

[138] صحيح مسلم بشرح النووي على كتاب البخاري (٥/١٣٨).

فتح الباري (٤/١١٤)

# وانەی شەشەم:

# ڕۆژوو ((الصيام)) (٣)

## ٧- ئەو شتانەی لە پاداشتی ڕۆژوو کەم دەکەنەوە:

أ- موخالەفەکردنی سوننەت لە پارشێو کردنـدا یـن لـە شـکاندنیدا یـان لـە ڕۆژدا یـان لـە شەودا..

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فليحذر الذين يخالفون عن امره ان تصيبهم فتنـة او يصيبهـم عذاب اليم﴾[١٤٠]

واتە/ با بترسێن ئەوانەی سەرپێچی فەرمانی پێغەمبەر دەکەن لەوەی تووشی بەڵا ببن یـان سزایەکی بەئێش بێتە سەریان.

ب- غەیبەت کردن، چاونەگرتن، زۆر خەوتن لە ڕۆژداو تەمبەڵ بوون، درۆ کـردن و بـەردەوام بوون لەسەر نەفامێتیو قسەی بێ سەرو بەر ئیمامی بوخاری بە سەنەدی خـۆی دەگێڕێتـەوە لـە ئەبو هورەیرەوە کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (من لم يدع قول الزور والعمل بـه فليس لله حاجة في ان يدع طعامه وشرابه).

واتە/ ئەوەی واز لە قسەی خراپ و کار پێ کردنی نەهێنێ ئەوە خوا پێویسـتی بـەوە نیـیـە واز لەخواردن و خواردنەوە بێنێ.

ج- حیلەی شەرعی وەک کات کوشتن بە دامەو شەترەنج و سـێ ڕسـکێن کردنـەوە یـان بـە قسەی بەتاڵ و پێکەنینەوە... ئیمامی ترمذی بە سەنەدی خۆی لە ئەبو هورەیـرەوە دەگێڕێتـەوە کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (الدنيا ملعونة، ملعون ما فيهـا الا ذكر الله وما ولاه وعالماً ومتعلما)[١٤١]

---

[١٤٠] سورة النور ٦٣

[١٤١] وقال حديث حسن الترغيب والترهيب للامام المنذري (١ / ٩٨) حديث رقم ١٨٠ كتاب العلم

بەلكو مانگی ڕەمەزان پێویستە هەلێکێ بێت بۆ پڕکردنی کەشکۆلی قیامەت چونکە کار لە ڕەمەزاندا بەرەکەتی زۆرەو کاریگەریشی لەسەر نەفس و دڵ هەر زۆرەو لایەق نییە بە موسڵمان پەنا بەرێتە بەر ئەو شتانەی کە پێ حێزن با (مباح)یش بن.

## ٨- سوودەکانی ڕۆژوو بۆ لەشی مرۆڤ:

أ- پشوویەکی باش دەدات بە گەدەو لەشی مرۆڤ، (**مصطفی** محمد عمرە خاوەنی کتێبی جواهر البخاری) کە ( ٧٠) فەرموودەی بخاری تێدا ڕاڤە کراوە دەڵێت:

پزیشکێکی ئەڵمانی بۆی گێڕامەوە کە جارێکیان نەخۆشێکێ دێتە لای ئازاری گەدەی دەبێت. بە هەموو جۆرە دەرمانێکێ چارەسەری دەکات هەر چاکێ نابێتەوەو شیفای نایەت، پاشان دەڵێت یەکێ دەرمان ماوە کە موسڵمانەکان بەکاری دەهێنن ئەویش ڕۆژوو گرتنەو دوور کەوتنەوەیە لە خواردن بۆ ماوەی (٢٤) سەعات بەرنامە بۆ ڕۆژوو گرتنەکەی دادەنێت و ماوەیەکێ ڕۆژووی پێ دەگرێت سەیر دەکات نەخۆشییەکەی نەماو شیفای بۆ هات و چاکێ بوەوە..[١٤٢]

ب- ڕاهاتنی لەش لەسەر خواردن لە چەند کاتێکی دیاری کراوداو بەرگە گرتنی لە هەل و مەرجی ناهەمواردا بە تایبەتی ئەگەر ڕۆژەوان ئێواران و پارشێوان لە سنووری سروشتی خواردن دەرنەچێت و هەقی ڕۆژەکەی بداتەوە.

## ٩- سوودەکانی ڕۆژوو بۆ زەین و فیکری مرۆڤ:

أ- ساف کردن و کردنەوەی ئاسۆیەکی فراوان لە مرۆڤ.. زۆرێکێ لە زانایان بۆ بەهێز کردن و پاڵفتەکردنی ڕەکوەتیان پەنایان بردۆتە بەر ڕۆژوو گرتن و ڕاهێنانی گیانی (**الریاضیات الروحیة**)

ب- قەڵغانێکی گەورەیە بۆ دوور کەوتنەوە لە گوناهو بیر کردنەوە لە خەتا.. ئەبو هورەیرە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی (**والصیام جنة واذا ما کان یوم صوم احدکم فلا**

---

١٤٢ جواهر بخاري ٥٢

بەلکو مانگی ڕەمەزان پێویستە هەلێک بێت بۆ پڕکردنی کەشکۆلی قیامەت چونکە کار لە ڕەمەزاندا بەرەکەتی زۆرەو کاریگەریشی لەسەر نەفس و دڵ هەر زۆرەو لایەق نییە بە موسڵمان پەنا بەرێتە بەر ئەو شتانەی کە بێ خێرن با (مباح)یش بن.

## ٨- سوودەکانی ڕۆژوو بۆ لەشی مرۆڤ:

أ- پشوویەکی باش دەدات بە گەدەو لەشی مرۆڤ، (**مصطفى** محمد عمارە خاوەنی کتێبی جواهر البخاري) کە ( ٧٠) فەرموودەی بخاری تێدا ڕاڤە کراوە دەڵێت:

پزیشکێکی ئەڵمانی بۆی گێڕامەوە کە جارێکیان نەخۆشێک دێتە لای ئازاری گەدەی دەبێت. بە هەموو جۆرە دەرمانێک چارەسەری دەکات هەر چاک نابێتەوەو شیفای نایەت، پاشان دەڵێت یەک دەرمان ماوە کە موسڵمانەکان بەکاری دەهێنن ئەویش ڕۆژوو گرتنەو دوور کەوتنەوەیە لە خواردن بۆ ماوەی (٢٤) سەعات بەرنامە بۆ ڕۆژوو گرتنەکەی دادەنێت و ماوەیەک ڕۆژووی پێ دەگرێت سەیر دەکات نەخۆشییەکەی نەماو شیفای بۆ هات و چاک بوەوە..[١٤٢]

ب- ڕاهێنانی لەش لەسەر خواردن لە چەند کاتێکی دیاری کراوداو بەرگە گرتنی لە هەل و مەرجی ناهەمواردا بە تایبەتی ئەگەر ڕۆژەوان ئێواران و پارشێوان لە سنووری سروشتی خواردن دەرچێت و هەقی ڕۆژوەکەی بداتەوە.

## ٩- سوودەکانی ڕۆژوو بۆ زەین و فیکری مرۆڤ:

أ- ساف کردن و کردنەوەی ئاسۆیەکی فراوان لە مرۆڤ.. زۆرێک لە زانایان بۆ بەهێز کردن و پاڵفتەکردنی ڕەکوەتیان پەنایان بردۆتە بەر ڕۆژوو گرتن و ڕاهێنانی گیانی (**الرياضيات الروحية**)

ب- قەڵغانێکی گەورەیە بۆ دوور کەوتنەوە لە گوناهو بیر کردنەوە لە خەتا.. ئەبو هورەیرە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی (**والصيام جنة واذا ما كان يوم صوم احدكم فلا**

---

١٤٢ جواهر بخاري ٥٢

**يرفث ولا يجهل)**[143]

**جنة/** واته قەڵغان لە (بیرکردنەی خراپ، گوناهو تاوان، ئاگری جەهەنـەم) ئـەویش بـەوەی ئارەزووی نەفسی کز دەکات و کەم مەیلی دەکات بۆ خراپە.

**فلا یرفث/** یانی با قسەی خراپ نەکات یان جیماع نـەکات.. **فلا یجهل/** بـا هیـچ شـتێک نەکات کە لە خولق و خووی نەفامان بێت)[144]

## ١٠- لە قازانجەکانی ڕۆژوو بۆ دڵ و نەفسی مرۆڤ:

أ- کـەفارەتی گوناهـەو دڵـی قـەڵایی دەکاتـەوەو پـاکی دەکاتـەوە... ئیمـامی موسـلیم لـە (**صحیح**)ەکەیدا لە ئەبو سـەعیدی خودریـیەوە دەگێڕێتـەوە کـە پێغەمبـەرﷺ دەفـەرموێت: **(الصلوات الخمس والجمعة الى الجمعة ورمضان الى رمضان مكفرات لما بينهن اذا اجتنبت الكبائر)**[145]

ب- زۆر سـیفاتی بـاش لـە نەفسـو دڵـیدا دەچێنێـت وەک/ بـەزەیی هاتنـەوە بـە برسـیو نەداراندا ئارام گرتن و خۆگرتنەوە، بەخشندەییو خێرکردن...هتد.

ج- باشـترین هـەل دەڕەخسـێنێت بـۆ ڕوو کردنـە عیبـادەتی زۆر لەگـەڵ ڕۆژووەکـەدا کـە هەردووکیان مایەی دروست کردنی (تەقوا)ن لە دڵدا.. خوا دەفەرموێت: ﴿**يا ايها النـاس اتقـوا ربكم الذي خلقكم والذين من قبلكم لعلكم تتقون**﴾[146]

هەروەها دەفەرموێت: ﴿**يا ايها الذين آمنوا كتب عليكم الصيام كما كتـب علـى الذيـن من قبلكم لعلكم تتقون**﴾[147]

د- مانگێکە دەرگای سەرکەوتن لە موسڵمانان دەکرێتەوەو سەرکەوتنیش لە گۆڕەپانـەکانی ژیاندا مایەی خۆشی دڵەو شیفای برینەکانی دڵی ئیماندارانە لە دنیای ئیسلامدا.. ﴿**وينصركم**

---

[143] فتح الباري كتاب الصيام ٤/٨٣.
[144] فتح الباري ٤/٨٣
[145] فقه السنة ١/٣٦٦
[146] البقرة ٩
[147] البقرة/١٨٣

عليهم ويشف صدور قوم مؤمنين﴾[١٤٨]

هەروەها دەفەرمويت: ﴿واخرى تحبونها نصر من الله وفتح قريب﴾[١٤٩]

هـ- هێزێکی گەورە دەدات بە دڵ بۆ پەیدا بوونی حەساسیەتی زیاتر بۆ گوناهو تاوان بە ڕادەیەک دەست بەرێت بۆ هەرچی بیری بکەوێتەوە ئایا زەرەر لە عیبادەتەکانی دەدات یان نا..

[١٤٨] التوبة ١٤

[١٤٩] الصف ١٣

# وانەی حەوتەم:

# ڕۆژوو ((الصيام)) (٤)

## ١١- ڕۆژووە سوننەتەکان

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ومن تطوع خيراً فان الله شاكر عليم﴾[١٥٠]

بە کورتی ڕۆژووە سوننەتەکان ئەمانەن و هەر کەسیش زیاتری دەوێت با کتێبەکانی فەرمودەو فیقهی ئیسلامی بخوێنێتەوە وەک (**نيل الاوطار وفقه السنة وصحيح البخاري والترغيب والترهيب وجامع الاصول**) وە هەروەها...

أ- ڕۆژی (عەرەفە) واتە ئەو ڕۆژەی کە حاجیانی ماڵی خوا لە عەرەفەدا دەوەستن و بۆ ڕۆژی دوای ئەو جەژنی قوربان دەکرێت.

ئیمامی مسلم بە سەنەدی خۆی لە ئەبی قەتادەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (..**وصيام يوم عرفة احتسب على الله ان يكفر السنة التي قبله والسنة التي بعده**)[١٥١] واتە/ بەڕۆژووبوونی ڕۆژی عەرەفە ئومێد دەکەم لەخوا کە ڕەشکەرەوەی تاوانی ساڵی داهاتوو و ڕابردووبێ.

ب- ڕۆژی عاشورا واتە ڕۆژی (١ ١)ی مانگی (موحەڕەم)..

پێغەمبەر ﷺ هەر لە حەدیسی مسلم دا دەفەرموێت:

(**وصيام يوم عاشوراء احتسب على الله ان يكفر السنة التي قبله**)[١٥٢]

واتە/ ڕۆژووی (عاشوراء) داوا دەکەم لەحوا تاوانی ساڵی پێشوو ڕەش بکاتەوە.

ج- ڕۆژووی (أيام البيض)، سێ ڕۆژ لە هەموو مانگێک کە لە فەرمودەی مسلم دا

---

البقرة/١٥٨

ارشاد السـ ـي

ارشاد الساري ١٥٥

هاتووه بەناوی (سرة الشهر) نەوەوی دەفەرموێت: (**سرة الشهر أي وسطه**)[153]، هەروەها نەوەوی دەفەرموێت لە (**سنن الترمذي**)دا هاتووە کە ئەو سێ ڕۆژە (١٣، ١٤، ١٥)ی هەموو مانگێکە... (ئیمامی ئەبو داودو نسائی)یش هەردووکیان بە سەنەدی خۆیان لە عبدالملك کوڕی ملحانی ئەویش لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە کە گوتوویەتی (**کان رسول اللهﷺ یأمرنا ان نصوم البیض: ثلاث عشرة، واربع عشرة، وخمس عشرة.. قال: وقال: هن کهیئة الدهر**)[154]

بوخاریش پشتی ئەم سێ ڕۆژە دەگرێت لە (**صحیح**)ەکەیدا[155]

د- شەش ڕۆژ لە (شەوال) جا هەرچۆنێك دەیگرێت (١٣، ١٤، ١٥)ی تێدا بێت یان نا، پاش ڕۆژی یەکەمی جەژن دەست پێ دەکات یان نا، بەسەریەکەوە هەر شەشەکەی دەگرێت یان جیاجیاو بە مەیلی خۆی، هەر هەموویان دروستن و پاداشتی خۆی لەسەر وەردەگرێت.. ئیمامی موسلیم بە سەنەدی خۆی لە ئەبی ئەیوبی ئەنساریەوە دەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (**من صام رمضان وأتبعه ستاً من شوال کان کصیام الدهر**)[156]. ئەو قسەی ئیمامی مالیکیش کە لە (الموطأ)دا دەفەرموێت (**ما رأیت احداً من اهل العلم یصومها، قالوا فتکره لئلا یظن وجوبها**) لەبەر ئەوەی موخالیفی حەدیسی (**صحیح**)ەکەو قسەکەش خۆی دەلیل نیە ڕەت دەکرێتەوە.. ئیمامی نەوەوی دەفەرموێت: (**اذا ثبتت السنة لا تترك لترك بعض الناس او اکثرهم او کلهم لها**)[157]

## ١٢- چەند وەسیەت و ئامۆژگاری:

مانگی ڕەمەزان وەك گوتمان هەلێکەو ڕەخساوە بۆ موسڵمان و دەتوانین ناوی بنێین ((وەرزی بانگەواز))، تێیدا موسڵمان خۆی ساز بداتەوەو ئاستی گیانیو زانستیو ڕۆشنیری

---

رشاد نسـ ي ١٥٤

جامع لاصول من احادیث الرسول لابن الاثیر، ٧-٢١٤ حدیث رقم (٤٤٧٠)

فتح الباري ٤/١٨٣

ارشاد الساري محشي بشرح صحیح مسلم (٥ ١٦٢)

رشاد الساري (٥ ١٦٣).

بەرز بکاتەوەو قۆڵی خزمەت کردنی دینی خوای تێدا هەڵ بکات و ئەو خەڵکە زۆرەی ڕووی لەخوا کردووە گرێیان بدات بە دینەوەو هێزەکانیان بخاتە سەر هێزی موسڵمانان و قەوارەی ئیسلامی گەورەتر بکات..

لەو وەسیەتانەی بە پێویستی دەزانین بۆ مانگی رەمەزان ئەوانەیان باس دەکەین:

أ- دەست بەتاڵ بوون (تفرغ) بۆ وەرگرتنی ڕێژەیەکی زیاتری زانستە شەرعی‌یەکان بە تایبەتی زانستەکانی قورئان و سوننەت..

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿واعلم انه لا اله الا الله واستغفر لذنبك﴾[158]

ئیمامی بوخاری بە سەنەدی خۆی لە ئیمامی عومەرەوە دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: **كنت وجار لي من الانصار في بني امية ابن زيد وهي من عوالي المدينة وكنا نتناوب النزل على رسول الله ﷺ ينزل يوماً وانزل يوماً، فاذا نزلت جئته بخير ذلك اليوم من الوحي وغيره واذا نزل فعل ذلك..)**[159]

ئەم زانست وەرگرتنە باشترە دابەش بکرێت بەسەر دوو بواردا، بوارێکی تیۆری وبوارێکی کرداری.. بوارە تیۆری‌یەکەی بریتی‌یە لە خوێندنەوەو موتاڵا کردن لە ڕووی بەرنامەیەکی جێگیرەوە... بوارە کرداری‌یەکەشی لە ڕووی دەرس خوێندنێکەوە بێت وەک ئەو شێوازەی ئیمامی عومەر لەگەڵ ئەنصاری‌یەکە (عوتبەی کوڕی مالیک- **التجريد الصريح كتاب العلم حديث رقم -٧٨**)دا گرتبوە بەر.

ب- بەهێزکردنی سیفەتی (بەخشندەیی)، چونکە بەخشین لە ڕەمەزاندا دوو خێری هەیە خێری بەخشینەکەو خێری تێرکردن و بەربانگ کردنەوە بەڕۆژوەوان.

ئیمامی بوخاری لە (صحيح)ەکەیدا دەفەرمووێت: عبداللەی کوڕی عەباس دەفەرمووێت: **كان النبي ﷺ اجود الناس بالخير وكان اجود ما يكون في رمضان حين يلقاه جبريل وكان جبريل يلقاه كل ليلة في رمضان حتى ينسلخ يعرض عليه النبي ﷺ القرآن، فاذا لقيه جبريل**

---

[158] محمد/١٩

[159] كتاب العلم باب التناوب في العلم - مختصر الصحيح البخاري المسمى التجريد الصريح لاحاديث الجامع الصحيح - للامام الزبيدي حديث (٧٨).

**(عليه السلام) كان اجود بالخير من الريح المرسلة)**[١٦٠]

واته/ پێغەمبەرﷺ بەخشندەترین کەس بوو لە چاکەدا، بەڵام لە ڕەمەزاندا لە هەموو کاتێک بەخشندەتر دەبوو، کاتێک جبریل دەهاتە لای وە جبریل هەموو شەوێکی ڕەمەزان دەهاتە لای تا کۆتایی دەهات، قورئانی بەسەردا دەخوێندەوە جا کاتێک جبریل پێی دەگەیشت بەشندەتر دەبوو لەبای بەرهەڵ بوو.

ج- زیاد کردنی عیباداتی زیاد بەتایبەتی:

- قورئان خوێندن.

- تەراویح.. چونکە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: **(من قام رمضان ايماناً واحتساباً غفر له ما تقدم من ذنبه)**[١٦١] واته/ هەر کەسێک ڕەمەزان هەستێتەوە بە باوەڕو بەتەمای پاداشتی خوابێ، دەبەخشرێن تاوانە پێشووەکانی.

د- هەوڵ بدات زۆرترین کاتی لە ڕەمەزاندا سەرقاڵی فێرکردنی خەڵک بێت لەو زانست و دەرکەی خوا پێی داوە..

لە پێغەمبەری خواﷺ دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی:

**(من جاء مسجدي هذا لم يأته الاّ لخير يتعلمه او يعلمه فهو بمنزلة المجاهدين في سبيل الله، ومن جاء بغير ذلك فهو بمنزلة الرجل ينظر الى متاع غيره)**[١٦٢]. واته/ هەر کەسێک بێتە مزگەوتەکەی من تەنها بۆ فێربوون یا فێرکردنی چاکە هاتبێ ئەوە وەکو موجاهیدانی ڕێگەی خوا وایە وە هەر کەسێک بۆ غەیری ئەوە بێ وەک ئەوە وایە تەماشای کەل و پەلی خەڵکی بکات.

هـ- مامۆستا هەوڵ بدات خشتەیەک دەربکات بۆ قوتابیەکانی کە لەو مانگەدا کاری پێ بکەن.

---

فتح الباري (٤/٩٣).

فتح الباري (٤ ٣ ٢)

رواه ابن ماجة والبيهقي وقال الامام المنذري في (الترغيب والترهيب) -كتاب العلم ١/١٠٥ وليس في اسناده من ترك ولا جمع على ضعفه.

# وانەی یەکەم:

# ئادابی قورئان خوێندنەوە

١- بەدەست نوێژەوە دەبیو هەروەها جل و بەرگ و شوێنیو لاشەی پاک و خاوێن بیو سیواکی کردبی

٢- شوێنێکی بی دەنگ و کاتێکی گونجاو هەڵبژێرێ، چونکە بەم جۆرە بەجۆشتر دەبیو دڵی سافتر دەبیو نیەت و نیازی پاکتر دەبیو دەرووی ئاسوودەتر دەبێ.

٣- بە ویقارو رێزەوە دابنیشێ وەک بڵێی قورئانی بۆ سەر دێتە خوارەوە، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿**لو أنزلنا هذا القرآن على جبل لرأيته خاشعاً متصدعاً من خشية الله وتلك الأمثال نضربها للناس لعلهم يتفكرون**﴾[١٦٣]

واتە / ئەگەر ئەو قورئانەمان دابەزاندبایە سەر چیایەک بێ گومان دەتبینی بەملکەچ و ترس و لەرزەوە لەترسی خوا پارچە پارچە دەبوو ئێمە بۆیە ئەم نموونەو وێنانە دێنینەوە بۆ خەڵکی تاوەکو بیر بکەنەوەو سەرنج بدەن.

٤- لە سەرەتاوە (**استعاذة**) بکات و بڵێ (**اعوذ بالله من الشيطان الرجيم**) چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿**وإذا قرأت القرآن فاستعذ بالله من الشيطان الرجيم**﴾[١٦٤] پاشان ناوی خوا بێنیو بڵێ (بسم الله الرحمن الرحيم).

٥- پەیڕەوی یاساکانی (تجويد) بکات و پیتەکان لە مەخرەجی خۆیانەوە دەربێنێ.

٦- لەکاتی قورئان خوێندنەوەکەیدا دەنگی خۆی خۆش بکات و پیتەکانیش لە ئەندازەی خۆی درێژتر نەکاتەوە، بەم جۆرە کاریگەری زیاترە.

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: (**ليس منا من لم يتغن بالقرآن**)[١٦٥]

---

[١٦٣] الحشر
[١٦٤] النحل/٩٨
[١٦٥] صحيح رواه ابو داود والحاكم.

واته/ ئەو کەسە لە ئێمە نىيە کە بەدەنگ خۆشىيەوە قورئان ناخوێنێتەوە.

٧- لە ماناى ئايەتەکان ورد بێتەوەو لەگەڵياندا بخرۆشێ و، کاتێ دەگاتە ئەو ئايەتانەى داخوازىيان تێدايە لە خوا بپاڕێتەوە و داواى بەهەشت بکات، وە ئەو ئايەتانەى خۆپەنادان (تعوذ)يان تێدايە داواى خۆپەنادان بکات لەخواى گەورە.

٨- گوێ گرەکان پێويستە لەسەريان بێ دەنگ بن و گوێ لە قورئانەکە بگرن و قسە نەکەن و سەرنجى خۆيانى بدەنىو جگەرەکێشان و هەر شتێکى ديش کە خەريکيان دەکات بەلاوە نێن و خۆيانى لێ بپارێزن، چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿**واذا قريء القرآن فاستمعوا له وانصتوا لعلكم ترحمون**﴾[166]

٩- ئاسايىيە قەيدى ناکات کە ئەگەر کۆمەڵێک لەدواى يەک بەيەکەوە قورئان بخوێننەوە چونکە لە امام (مالک)يان پرسيوە گوتوويەتى ئاسايىيە (لا بأس به) چەمکى ئەم فەرموودەيەش کە دەفەرموێ: (... **ما اجتمع قوم في بيت من بيوت الله يتلون كتاب الله ويتدارسونه بينهم الا نزلت عليهم السكينة وغشيتهم الرحمة وحفتهم الملائكة وذكرهم الله فيمن عنده**)[167]

بەڵگەيە لەسەر دروستێتى ئەوەى کە بەيەک لەدواى يەکى قورئان بخوێننەوە لەکاتى خوێندنەوەيدا.

١٠-وا چاک (مستحب)ە کە لەو جێگايەوە دەست پێ بکات کە مانايەکەى لەوێوە دەست پێ دەکات، وە لەو جێگايەش کۆتايى پێ بهێنێت کە ماناکەى کۆتايى پێ دێت.

١١- وا باشترە بە بەردەوامى قورئان بخوێنێ لە شەوو لە رۆژدا لە ماڵ و لەسەفەردا تەنانەت ئەگەر بەش (جزئێک)يشى لەدەست چوو با لەو کاتەدا بيخوێنێتەوە کە پێى دەکرێ يان ئەو کاتەى بيرى دەکەوێتەوە، لەبەر ئەم فەرموودەيەى کە ئيمامى عومەر (رضي الله عنه) دەفەرموێ پێغەمبەرﷺ فەرمووى: (**من نام عن حزبه أو شيء منه فقرأه ما بين صلاة الفجر وصلاة الظهر كتب له كأنما قرأه من الليل**)[168]

---

[166] الاعراف/٤ ١

[167] رواه مسلم وابو داود.

رواه مسلم.

١٢- لەدوای تەواو کردنی (ختم)ی قورئـاندا داوای نـزا بکـات. لـه موجـاهیدەوه ریوایـەت کراوه کە لە (کاتی خەتم کردنی قورئاندا کۆ دەبوونەوەو دەیانگوت: ڕەحمەت دادەبەزێت).

هەروەها ئەبو داود ریوایەت دەکات و دەڵێت: (مالکی کوڕی ئەنەس -خوا لێی ڕازی بێت که قورئانی ختم دەکرد بانگی ماڵەوەی دەکردو دوعای دەکرد).

# وانەی دووەم:

# ئادابی ئاخاوتن و قسەکردن

١- ئەگەر قسەت کرد لەبارەی خێرو کاری بەسوود قسە بکە ئەگەرنا بی دەنگ بە وەک پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: (من كان يؤمن با لله واليوم الآخر فليقل خيراً او ليصمت)[١٦٩]

ئیمامی نەوەوی -ڕەحمەتی خوای لی بێ- دەفەرموێ: (پێویستە موسڵمان ئەگەر قسەی کرد لەبارەی چاکەوە قسە بکات ئەگەرنا بی دەنگ بێت. جۆ ئەگەر شتێک نەچاکەی هەبوو نەخراپە ئەوەش هەر نەگوترێ باشترە)

٢- پێویستە لەسەرخۆ قسە بکات و دەنگی زۆر بەرز نەکاتەوە، بە شێوەیەکی بیستراو بێ لە ئەندازەی خۆی زیاتر دەنگ بەرزو نەرم نەکاتەوە. حەتوو عائشە -خوای لی ڕازی بێ- دەفەرموێت: (ما كان رسول الله ﷺ ليسرد كسردكم هذا، ولكنه كان يتكلم بكلام بين فصل يحفظه من جلس اليه)[١٧٠]

واتە/ پێغەمبەر وەکو ئێوە قسەی نەدەکرد بەخێرایی، بەڵکو قسەکانی زۆر ڕوون و دیارو ئاشکرا بوون هەر کەسێک لای دانیشتبایە قسەکانی وەردەگرتن و لەبەری دەکردن.

٣- پێویستە پڕ بەپڕی خۆی مافی دانیشتنەکە بدات و لەکاتی جیددی بوندا گاڵتە نەکات و لەکاتی خەم و پەژارەدا پێکەنینی و ڕەچاوی هەست و هەستی ئامادەبووان بکات.

٤- زۆر نەڵێت و سنوور نەبەزێنێ و باس لەو بابەتانە نەکات کە پەیوەندییان بەوەوە نییە وەک پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: (من حسن اسلام المرء تركه ما لا يعنيه)[١٧١] واتە/ لە ڕەوشتی جوانی ئیسلامەتییە واز هێنان لەو شتانەی پەیوەندی پێیانەوە نییە.

٥- هەواڵێک بڵاو نەکاتەوە کە سەرچاوەکەی نەزانرێ و دڵنیا نەبێ لە ڕاستی قسەکە وەکو

---

[١٦٩] متفق عليه.

[١٧٠] رواه مسلم.

[١٧١] رواه الترمذي و احمد وابن ماجه وحسنه النووي وابن عبدالله وصححه الالباني

خوای گهوره دهفهرموێت: ﴿يا أيها الذين آمنوا ان جاءكم فاسق بنبأ فتبينوا﴾[١٧٢]

٦- رازو نهێنی هیچ کهسێک دهرنهخات بهبێ پرسی خاوهنهکهیو ههرچی زانی نهیدرکێنێ.

پێغهمبهرﷺ دهفهرموێ: (كفى بالمرء كذباً ان يحدث بكل ما سمع)[١٧٣]

٧- زۆر پێنهکهنێ چونکه پێکهنینی زۆر دڵ دهمرێنێ.

٨- لهکاتی قسهکردن بۆ کۆمهڵێک پێویسته تهماشایان بکات و سهر لهبهرخۆی سهنێ بۆ ئهوهی بهرامبهرهکانی بێ تاقهت نهبن و ئاگاداری حاڵیان بێ.

١- وا چاکه له قسهکردندا بهدوای ووشهی جوان ورستهی رێک و پێکدا بگهرێت و به پێی توانا قسهی دڵ خۆشکهرو ههست بزوێن بکات وهک پێغهمبهرﷺ دهفهرموێ: (اتقوا النار ولو بشق تمرة فمن لم يجد فبكلمة طيبة)[١٧٤]

واته/ خۆتان لهئاگر بپارێزن ئهگهر به بهخشینی لهته خورمایهک بێت وه ههر کهسێک ئهوهشی نهبوو به ووتهی جوان و خۆش.

١١- له بارهی ههر شتێکهوه قسه بکرێ دهبێ به پێی ئاستی تێگهیشتن و رۆشنبیریو زانستیو ئهوهندهی پێویستیان پێیه قسه بۆ خهڵک بکرێت، ئهگینا وا نهبێت گومانی خراپ دهبهن و قسهکان به گاڵتهوه تهماشا دهکهن.

١٢- نابێ لهبارهی شتێکهوه قسه بکهیت که باش لێی شارهزا نهبیت بۆیه له شتێک که تێیدا له گوماندا بی باس نهکردنی باشتره.

١٣- لهکاتی پێویستیدا نهبێ به گشتی بێ دهنگی [illegible] له قسهکردن وهکو خاتوو عائشه دهفهرموێ: (كان رسول اللهﷺ طويل الصمت)

واته/ پێغهمبهرﷺ به زۆری بێ دهنگ بووه.

١٤- پێویسته لهو مهجلیس و دانیشتنانه دوور بکهوینهوه که باسی شتی ناڕهوا

---

[١٧٢] الحجرات/٦

رواه مسلم

متفق عليه

رواه احمد باسناد جيد

بێهودەیان تێدا دەکرێت وەک خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿**قد افلح المؤمنون الذين هم في صلاتهم خاشعون والذين هم عن اللغو معرضون**﴾[176]

واتە/ بەڕاستی ئەو ئیماندارانە سەرکەوتوون کە لە نوێژەکانیاندا مل کەچن و ئەوانەی دوورن لە قسەی بەتاڵ و بێ ماناو زیادە.

١٥- پێش ئەوەی قسە بکەین پێویستە بیر لە ماناکەی بکەینەوەو لێی بکۆڵینەوە کە ئەو قسەیە چی لێ دەفامرێتەوە وە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿**ما يلفظ من قول الاّ لديه رقيب عتيد**﴾[177]

واتە/ هیچ قسەیەک لە دەمیانەوە دەرناچێت ئیللا چاودێرێکی وردی وا بە سەرەوەیە یان فریشتەی پارێزەری ئامادە ئاگای لێیەتی.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (**ان العبد ليتلكم بالكلمة ما يتبين فيها يزلّ بها في النار ابعد ما بين المشرق والمغرب**)[178]

واتە/ بێ گومان بەدنە قسەی وا دەکات کە لێی روون نیەو تێی ناگات دەیخاتە ناو ئاگرەوە دوورتر لەنێوان رۆژهەڵات و رۆژئاوا.

١٦- گوێ لە قسەی هەموو کەس بگرە بەتایبەت کەسانی لەخۆت گەورەترو رێزدارترو زاناترو بەتەمەن تر وە چی چاکە بوو لە قسەکانیان وەری بگرەو ئەوی تریان واز لێ بێنە وەک خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿**الذين يستمعون القول فيتبعون احسنه**﴾[179]

واتە/ ئەوانەی گوێ لە قسە دەگرن و شوێن چاکترینیان دەکەون ئەوانە ئەو کەسانەن کە خوا ڕێنموونی کردوون و ئەوانە خاوەن ژیریو عەقڵن.

١٧- قسە بە هیچ کەس مەبڕەو لەکاتی قسە کردنی کەسێکدا بۆت سەیری بکەو گاڵتەو لاقرتێ بەکەس مەکە، وە دوور بکەوە لە نارەحەت کردن و دڵ شکاندنی خەڵکیو ڕاست کردنەوەی هەڵەو ناتەواویان لەناو کۆڕو کۆمەڵدا چونکە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿**وقولوا**

---

[176] المؤمنون/٣

[177] ق/١٨

[178] رواه البخاري ١١/٢٦٦/الرقاق ومسلم ١٨/١١٧/الزهد.

[179] الزمر/١٨

للناس حسناً﴾[180]

واته/ ووتەی باش بە خەڵکی بڵێن.

١٨- ئەگەر وای دەخواست قسەکانی بەرامبەرەکەت یان بیرو بۆچوونەکانی ڕاست کرێنەوە با بەدانایی‌و لێزانی‌و خۆشی‌و خۆشویستنەوە کارەکە ئەنجام بدرێت.

١٩- موسڵمان وەڵامی خەڵکی نەزان و نەفام ناداتەوەو لەگەڵیان دەبەرێک ڕاناچێت ﴿واذا خاطبهم الجاهلون قالوا سلاماً﴾[181]

واتە: بەندەکانی خوای بەبەزەیی کەسانێکن کە نەفامەکان دوان لەگەڵیانداو نەفامی‌یان بەرامبەر کردن ئەوان وەڵامی قسە ناشیرینەکانیان نادەنەوە بەڵکو وازیان لێ دێنن.

٢٠- زیاد لە ئەندازەی پێویست دەنگ بەرز مەکەوەو دوور بکەوە لە هەڵچوون و قیژاندن خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿واقصد في مشيك وأغضض من صوتك﴾[182]

واتە/ لە ڕۆیشتندا هێواش و مام ناوەندی بەو دەنگیشت بەرز مەکەوە.

٢١- پێویستە هێمن و دەم بەزەردەخەنە بیت لەکاتی قسە کردندا.

٢٢- خۆت دوور بگرە لە گوتنی ووشەی ناشیرین و نزم چونکە موسڵمان دەم شڕو جنێووێژ نی‌یە: (ليس المؤمن بالطعان ولا اللعان ولا الفاحش والبذيء)[183]

واتە: بڕوادار تانەدەرو نەفرین کەرو توانج هاوێژو جنێودەر نی‌یە.

٢٣- خۆت لە سوێند خواردن بپارێزە (واحفظوا ايمانكم)[184]

واتە/ سوێندەکانتان بپارێزن و بەجێیان بهێنن.

٢٤- ئەگەر سوێندت خوارد سوێند بەخوا بخۆ نەک بە پێغەمبەر یان کەعبە یان فریشتە یان سەری باوک و شەرەفی کەس و کارو یان قەبرو گۆڕی فلان پیاوچاک و فلان ئیماندار. ابن عمر دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (ان ا لله تعالى ينهاكم ان تحلفوا بآبائكم فمن

---

البقرة/٨٣

[181] الفرقان/٦٣

[182] لقمان/١٩

[183] رواه الترمذي.

[184] المائدة/٧٩

كان حالفاً فليحلف با لله او ليصمت)[185]

واتـه/ خـواى گـەورە قەدەغـەتان دەكـات كـە سـوێند بـەباوك و باپيرتـان بخـۆن، ئينجـا هەركەسێك سوێند دەخوات با سوێند بەخوا بخوات و يان با بێ دەنگ بێت.

٢٥- هەر كاتێك هەڵەيەك يان وتەيەكى نادروسـت لـەدەمت دەرچـوو زوو پەشـيمان بـەوە لێىو داواى لێ خۆش بوون لەخواى گەورە بكە.

٢٦- زمانت بپارێزە لە وتەى حەرام و ئەو شتانەى ئاشوب و پشێوى دەخەنەوە لەوانە:

أ- درۆكردن هەر چەندە بۆ گاڵتەو گەپيش بێت.

ب- باسكرددن (غيبة)ى يەكێك لەپاش ملەو بـەو سـيفەتانەى پـێ ناخۆشـەو دەيشـكێنىو نرخى كەم دەكاتەوەو عەيبەكانىو ناتەواوى دەردەخات.

ج- بوختان و قسەهەڵبەستن بە درۆ لەسەر خەڵكى.

د- دووزمانىو گواستنەوەى قسەى خەڵكى بۆ ئاژاوە نانەوە لەنێوانياندا.

هـ- گفت و گۆو قسەكردنى پاش بڕاوو بێ بەرهەم (الجدل العقيم)و وت و وێژ لەو بابەتانەى بێ سەرەنجامن.

و- پاكانە بۆخۆ كردن و خۆهەڵكێشان و گەورەكردنى ئيش و هەڵس و كەوتەكان و شـانازى كردن بەڕابردووەوە: ﴿فلا تزكوا انفسكم هو اعلم بمن اتقى﴾[186]

ز- جنێودان و قسەى ناشيرين و تانەو تەشەرگرتن لە خەڵكى.

ح- زەم كردن و بەكەم زانينى هەر دروست كراوێك ياخود نزا كردن لێيان.

ط- زۆر پێداگوتن و مەدح كردن تا دەگاتە ئاستى خۆبردنە پێشـەوەو دووڕوويـىو (نفـاق)و ڕووپامايى (الرياء) كردن.

ى- پەيوەندى جينسى نێوان خۆىو خێزانەكەى.

تێ بينى: لەكاتى قسەكردندا دەسـت لـەدەم و ددان و لـووت وەرمـەدەو ئـەدەبى مـەجليس ڕەچاو بكە.

---

[185] متفق عليه.

[186] النجم/٣٢

# وانەی سێهەم:

# ئادابی نوستن

١- زوو بخەوێت تاوەکو بتوانێ بە ئاسانی لـە درەنگی شـەودا بەخەبـەر بێـت و بـەگورج و گۆڵیو چالاکیەوە عیبادەتەکانی ئەنجام بدات، خاتوو عائشە دەفـەرموێت: پێغەمبـەرﷺ لـە سەرەتای شەوەوە دەنوست و لە کۆتایی شەویشەوە هەڵدەسـتا نوێـژی دەکـرد، واتـە شـەونوێژی دەکرد.

٢- سوننەتە پێش نوستن دەست نوێژ بگرێو ئنجا بکەوێت بەسەر لای ڕاستدا ئـەم دوعایـە بخوێنێ، کە دەری دەبڕێ بۆ خوای گەورە کە خۆی تەسلیم کردووەو ڕووی تـێ کـردووەو هـەموو کارێکی خۆی پێ سپاردووەو پاڵی پێوە داوەو، لە لایەکەوە لە خۆشی ئەو ئازو نیعمەتەی کە بۆ خواناسانی ئامادە کردووە، لە لایەکی دیکەشەوە لەترسی ئەو سزاو ئازارەی کە بۆ یـاخی بوانـی ئامادە کردووە، وە دەری دەبڕێ کە هیچ پەناو ڕزگاریـیەک نییە لە دەستی خوا جگە لە پـەنای خۆی، وە دەڵێ: بڕوام هێنا بەو پەڕاوو کتێبەت کە ناردووتە خوارەوە کە قورئانی پیرۆزە وە بە پێغەمبەرەکەت کە ڕەوانەت کردووە -کە محمد-ﷺە.

پێغەمبەرﷺ بەڵێن دەدات ئەگەر موسڵمان ئەم دوعایە بخوێنێو ئـەو شـەوە بمـرێ ئـەوا لەسەر **فیطرةو** ئاینی ئیسلام مردووە، وە فەرمانی داوە ئەم دوعایە دوا وتەی ئەم شەوە بێت.

-بەڕائی کوڕی عازب -خوا لێی ڕازی بێت- دەفەرموێ: پێغەمبــەرﷺ فەرموویـەتی: (**اذا اخذت مضجعك فتوضأ وضوءك للصلاة ثـم اضطجـع علـى شـقك الأيمـن ثـم قـل: اللهـم اسلمت نفسي اليك ووجهت وجهي اليك، وفوضت امري اليك، وألجـأت ظهـري اليـك، رغبة ورهبة اليك، لا ملجأ ولا منجى منك الاّ اليك، آمنت بكتـابك الـذي انزلـت ونبيـك الذي ارسلت فاذا متَ مت على الفطرة واجعلهن آخر ما تقول**)[١٨٧]

---

[١٨٧] البخاري رقم ١٩٨٠ مع الفتح/١١/١١٣ ومسلم ٢٧١٠/٤/٢٠٨١

٣- سوننەتە پێش نوستن ئەم ئایەت و سورەتانە بخوێنرێ چونکە پێغەمبەرﷺ وای کردووەو فەرمانیشی داوە بە ئێمە:

أ- **آية الكرسي (ا لله لا اله الاّ هو الحي القيوم...)البقرة/٢٥٥** هەروەکو پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ ((**اذا آويت الى فراشك فاقرأ آية الكرسي (ا لله لا اله الا هو الحي القيوم) حتى تختمها فانه لايزال عليك من ا لله حافظ ولا يقربك شيطان حتى تصبح...**))[١٨٨]

ب- دوو ئایەتەکانی کۆتایی سورەتی (البقرة)، ﴿**آمن الرسول...**﴾ واتە ئایەتی (٢٨٥-٢٨٦) هەروەکو پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: (**من قرأ آيتين من آخر سورة البقرة في ليلة كفتاه**)[١٨٩]

ج- ﴿**قل هو ا لله احد**﴾و ﴿**قل اعوذ برب الفلق**﴾و ﴿**قل اعوذ برب الناس**﴾ سێ جار هەروەکو پێغەمبەرﷺ هەموو شەوێ کە دەچووە جێگاوە هەردوو لەپی دەستی کۆ دەکردەوەو فووی پێدا دەکردن و ئەم سێ سورەتەی دەخوێند پێیاندا دوای ئەوە هەرچەندی توانیبای دەستی دەهێنا بە لاشەیدا، لە پێشەوە بەسەریو دەم و چاوی دەستی پێ دەکرد وە پێشەوەی لاشەیی، ئەمەی سێ جارە دەکردەوە.

((**كان اذا اوى الى فراشه كل ليلة جمع كفيه ثم نفث فيهما فقرأ فيهما (قل هو ا لله احد)و (قل اعوذ برب الفلق)و (قل اعوذ برب الناس) ثم يمسح بهما ما استطاع من جسده يبدأ بهما على رأسه ووجهه وما أقبل من جسده ويفعل ذلك ثلاث مرات**))[١٩٠]

٤- لە حوذەیفەی کوڕی یەمانەوە -خوا لێی رازی بێ- دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر بچوایە بۆ سەر جێگای نوستن دەی فەرموو: (**باسمك اللهم أموت وأحيا**)[١٩١]

واتە/ بەناوی تۆ خوایە دەمرم و زیندوو دەبمەوە.

وە پێغەمبەرﷺ زۆر ئایەت و ویردوو دوعای دیکەشی خوێندووە.

---

[١٨٨] البخاري مع الفتح/٤/٤٨٧.

[١٨٩] البخاري مع الفتح/٩/٩٤، ومسلم/١/٥٤.

[١٩٠] البخاري مع الفتح/٩/٦٢، ومسلم/٤/١٧٢٣

[١٩١] البخاري مع الفتح/١١/١١٣ ومسلم ٤/٢٠٨٣

٥- چاك وایه موسڵمان بەر لە نوستنی پرسیارو وەڵامێکی ورد لەگەڵ خۆیدا بکات لە بەرامبەر سەرلەبەری کردەوەکانی کە لەو ڕۆژەدا ئەنجامی داون، ئنجا کە بە چاکەیەکی خۆی ڕادەبورێ سوپاسی خوا بکات وە کە تاوان و گوناهێکی کردبێ با داوای لێ خۆش بوون بکات و تۆبەی لێ بکات، ئیمامی عومەریش -خوا لێی رازی بێ- گوتویەتی: (**حاسبوا أنفسكم قبل ان تحاسبوا وزنوا اعمالكم قبل ان توزنوا وتزينوا للعرض الاكبر**).

واتە/ لێپرسینەوە لەگەڵ خۆتان بکەن پێش ئەوەی لێ پرسینەوەتان لەگەڵ بکرێ وە کردەوەکانتان بکێشن پێش ئەوەی لەسەرتان بکێشرێن وە خۆتان ئامادە بکەن بۆ ڕانواندنی گەورە.

٦- وا چاکە جێگاکەی پێش پاڵکەوتن هەڵتەکێنێ تاوەکو دڵنیابێت لەوەی زیندەوەری زیانبەخش و زەرەرداری تێدا نییە، ئنجا پاڵداتەوەو بنوێت، بە تایبەتی لە گوندو دێهات وبێستان وشوێنە کشت و کاڵیەکان کە زیندەوەری زۆرترە لە شارەکان.

٧- مەکروهە لەسەر ڕوو بخەوێت چونکە زیانی لاشەیی و دەروونی و تەندروستی هەیە، ئیمامی بوخاری دەگێڕێتەوە کە (یەعشی کوڕی طەحفەی غیفاری) گوتویەتی: (باوکم گوتی: جارێکیان لە مزگەوتدا لەسەر زگ ڕاکشا بووم، پیاوێک بەپێ منی هوشیار دەکردەوەو دەی گوت: ئەو جۆرە نوستنە خوا ڕقی لێ دەبێتەوە کە تەماشام کرد دیتم پێغەمبەری خوا بوو ﷺ)[١٩٢]

٨- جێگایەکی فراوان هەڵبژێرێ بۆ نوستنی خۆی و منداڵەکانی و جێگای کوڕان لەنێو کچان جیا بکاتەوەو هەر یەکەو لێفەیەکی (پێخەفێکی) تایبەتی هەبێ وە وەجلکی نەرم و فراوان و داپۆشەر لەبەر بکات تاوەکو لاشەی دەرنەکەوێت.

٩- لەپێش نوستندا پەنجەرەو دەرگاکان دابخات و ئاگر بکوژێنێتەوەو سەری مەنجەڵ و قاپ و قاچاخ دابخات، هەروەکو جابر -خوا لێی رازی بێ- دەفەرموێت پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (**اطفؤا المصابيح بالليل اذا رقدتم واغلقوا الابواب وأوكئوا الاسقية وخمروا الطعام والشراب**)[١٩٣]

---

[١٩٢] رواه ابو داود.

[١٩٣] متفق عليه.

واته/ که نوستن چراکان بکوژێننـەوەو دەرگاکـان دابخـەن و قاپـەکان بپـارێزن و خـواردن و خواردنەوە داپۆشن.

١٠- ئەگەر خەونێکی خۆشی دیت با ستایشی خوا بکات و بـۆ برادەرەکـانی بگێڕێتـەوە وە ئەگەر خەونێکی ناخۆشیشی دیت با (استعاذة) بکات و بۆ کەسیش نەیگێڕێتەوە.

((فقد روي عن ابي سعيد الخدري انه سمع رسول الله ﷺ يقول: (اذا رأى احدكم رؤيا يحبها فانما هي من الله تعالى فليحمد الله عليها وليحدث بها وفي روايـة (فـلا يحـدث بهـا الا من يحب) واذا رأى غير ذلك مما يكره فانما هي من الشيطان فليستعذ من شرها ولا يذكرهـا لاحد فانها لا تضره))[١٩٤]

[١٩٤] متفق عليه.

# وانەی چوارەم:

# ئادابی لەخەو هەستان

١- بەیانیان زوو لەخەو هەستێ تاکو دەروونی ئاسوودەو لەش ساغ بێت لەو کاتە پاک و بێ گەردەدا با سوود وەربگیێ بۆ خوا پەرستیو قورئان خوێندنەوە. هەروەک خوای گەورە دەفەرموێت لە باسی بڕواداراندا: ﴿**كانوا قليلاً من الليل ما يهجعون وبالاسحار هم يستغفرون**﴾[١٩٥]

واتە/ بڕواداران کەمێک لە شەو دەحەسانەوە وە لە بەرەبەیانیاندا داوای لێ خۆشبوونیان دەکرد.

٢- یەکەم شت کە دەبێ بەسەر دڵ و زوبانی دابێت یادی خوداو یەکتاپەرستیو پاڕانەوە بێت بەو دوعایانە کە لە پێغەمبەرﷺەوە هاتوون لەوانە گوتنی:

أ- (**الحمد لله الذي أحيانا بعدما أماتنا واليه النشور**)[١٩٦]

واتە/ سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە لەدوای مراندن زیندووی کردینەوەو پاشەڕۆژو زیندوبوونەوەی قیامەتیش هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێتەوە.

**ب- قال رسول الله ﷺ: (من تعارّ من الليل فقال حين يستيقظ: [لا اله الا الله وحده لا شريك له، له الملك وله الحمد وهو على كل شيء قدير، سبحان الله،والحمد لله، ولا اله الاّ الله والله اكبر ولا حول ولا قوة الا بالله العلي العظيم ثم دعا رب اغفر لي غفر له] قال الوليد: او قال: ((دعا استحيب له. فان قام وتوضأ ثم صلى قبلت صلاته))**[١٩٧]

واتە/ هەر کەسێک شەو بە خەبەر هات و خەوی لێ نەکەوتەوە ئەگەر ئەم زیکرەی گوت وەیان داوای پێویستی کرد ئەوا گیرا دەبێت، وە ئەگەر دەست نوێژی گرت و نوێژی کرد ئەوا

---

[١٩٥] الذاريات/١٧/١٨

[١٩٦] البخاري مع الفتح/١١/١١٣ ومسلم/٤/٢٠٨٣

[١٩٧] البخاري مع الفتح/٣/٣٩ وغيره واللفظ لابن ماجه انظر صحيح ابن ماجه/٢/٣٣٥

نوێژەکەی وەردەگیرێ.

٣- پەلە بکات لەخۆ پاک کردنەوەداو دەست نوێژ بگرێت بۆ نوێژ، ئەبو هورەیرە دەڵێ پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (کاتێک مرۆڤ خەوی لێ کەوت، شەیتان سێ گرێ لەسەری دەدا، پێی دەڵێت: کە شەوێکی دوورو درێژت لەبەردەم دایە، بخەوە..! ئەگەر هەستاو یادی خودای کرد گرێیەک دەکرێتەوە، ئەگەر دەست نوێژی هەڵگرت گرێیەکی دیکە دەگرێتەوە، ئەگرر نوێژی کرد گرێی سێیەم دەکرێتەوەو رۆژ دەکتەوە بە دەروونێکی پاکەوە، ئەگەر وا نەبوو ئەوا بە تەمبەڵیو دەروونێکی پیسەەو رۆژ دەکاتەوە.

٤- خۆی بپارێزێ لەمانەوەو ئەملاو ئەولا کردن لەناو جێگادا.

٥- تەمبەڵ نەبێت لە هەستان بۆ نوێژەکان بەتایبەت نوێژی بەیانیان لەبەر سەرما یان ماندووبوون یان وەنەوزەدان.

٦- کە هەستا بە رێگایەکی بەسوود دەم و ددانی پاک بشوات و پاک بکاتەوە بەهۆی سیواک و دەرمان، ئەم دەم و ددان پاککردنەوەیە کارێکی باش و خاوێنەوە ددانەکان دەپارێزێ، خاتوو خەدیجە -خوا لێی رازی بێ- دەفەرموێت کە پێغەمبەرﷺ هەر کاتێک لەخەو هەستابایە دەم و ددانی بە سیواک پاک دەکردەوە.

٨- خۆی بپارێزێ لە بێزار کردن و ئازار دانی کەس و کارو دراوسێکانی لەکاتی هاتوو چۆو جم و جۆڵداو هێمنیو لەسەرخۆیی بپارێزێ.

٩- بە هێمنیو هێواش خەڵکانی دی خەبەر بکاتەوە بۆ نوێژەکانیان وە یادیان بخاتەوە کە نوێژ لە نوستن باشترە.

١٠- جێگاو بانەکەی رێک و پێک بکات و پشت بەخۆی ببەستێ لە کارەکانیداو هەوڵ بدات بۆ خۆی پێخەفەکان کۆ بکاتەوە.

# وانەی پێنجەم:

# ئادابی سەردانی نەخۆش

١- سوننەت وایە هەر کە زانیمان موسڵمانێک نەخۆش کەوتووە بە زوویی سەردانی بکەین، وە ئەگەر کرا دوو ڕۆژ یان سێ ڕۆژ جارێک سەردانی بکەینەوە تاوەکو دڵی بدرێتەوەو شادمان بێت. ثەوبان -خوا لێی ڕازی بێ- دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: **(ان المسلم اذا عاد أخاه لم يزل في مخرفة الجنة حتى يرجع)**[198]

واتە/ بێ گومان موسڵمان کاتێک کە سەردانی براکەی دەکات بەردەوام لە ڕێگەی بەهەشت دایە تاوەکو دەگەڕێتەوە.

٢- وا چاکە زۆر لەلای نەخۆش نەمێنێتەوە چونکە نەخۆش پێویستی بە حەسانەوەو نوستن هەیە مەگەر نەخۆشەکە خۆی داوا بکات.

٣- وا چاکە لە تەندروستیو ئەحواڵی نەخۆشەکە بپرسین تاوەکو هەست بە بایەخ پێ دان و گرنگی بکات وە پەیوەندیو خۆشەویستی موسڵمانێتی زیاتر ببێو نەخۆشەکە خەمی بڕەوێتەوە، هەروەها ئەوەش باشە کە هانی کەس و کاری بدرێ تا ئاگاداریو دیدەوانی نەخۆشەکە بکەن، دڵخۆشی نەخۆشەکەش بدرێ بۆ ئەوەی ئارام بگرێو تووشی بێ هیوایی نەبێت، وە باسی پاداشت و خێری سەبرو ئارام گرتنیشی بۆ بکرێ.

٤-چەند وتەیەکی پڕ لە هیواو شادمان کەر بۆ نەخۆشەکە باس بکەن وەکو (ئەمڕۆ لە دوێنێ باشتری لە ڕەنگ و ڕووتدا دیارە چاکتر بووی...هتد).

هەروەها چاکەکانی وەبیر بێنینەوە چونکە باری دەروونیی نەخۆش زۆر کار دەکاتە سەر لایەنی تەندروستییەکەی.

٥- دوعا بکرێ بۆ نەخۆشەکە تاوەکو مەعنەویاتی بەرز ببێتەوە وەکو لە **صحيحی**

---

[198] صحيح اخرجه احمد ومسلم والترمذي.

بوخاریدا هاتووه که پێغەمبەرﷺ سەردانی هەر کەسێکی کردبا دەیفەرموو (**لا بأس طهور ان شاء ا لله**)[199]

واتە/ چ نی‌یە نەخۆشیەکەی ئاسانەو مەترسیەکی تێدا نی‌یە بە کۆمەکی‌و یارمەتی خوا پاک کەروەیە لە گوناهو تاوان وە پاک کەرەوەیە لاشەیەتی لە دەردو نەخۆشی.

هەروەها دەتوانێ بڵێ: (**اذهب البأس رب الناس اشف وأنت الشافي لا شفاء الاّ شفاؤك شفاءً لا يغادر سقماً**)[200]

واتە/ خوایە نارەحەتی ئەم نەخۆشی‌یە لاببە، ئەی پەروەردگاری هەموو خەڵکی، شیفای بۆ بنێرە هەر خۆت شیفادەری شیفا نی‌یە جگە لەو شیفایەی کە خۆت بینێری، شیفایەک بنێرە نەخۆشی بەجێ نەهێڵی.

وە ئەگەر نەخۆشەکە ویستی خۆی بۆ خۆی دوعا بکات با بڵێ: (**بسم ا لله، ثلاثاً اعوذ با لله وقدرته من شر ما اجد واحاذر، سبع مرات**)[201]

چونکە پێغەمبەرﷺ بە عوسمانی کوڕی **ابو العاصي** گوت: دەست بخە سەر ئەو شوێنەی لاشەت کە ئازاری هەیەو بڵێ بەناوی خوا سێ جار وە حەوت جاریش ئەم زیکرە بڵێ کە پەناگرتنە بەخوای بە دەسەڵات و هێزو توانای خوا لە شەڕو خراپەی ئەو نەخۆشی‌یەی کە پێ‌یەتی وە لەوەی کە خۆی لا دەداو ئەپارێزێ نەوەکو تووشی ببێ.

عوسمان دەڵێ: چەند جارێک وام کرد بەمە هەر دەردێکم پێوە بوو خوای گەورە لای دەبردو هەتا ئێستاش فەرمان دەدەم بەسەر ماڵ و منداڵ و کەسانی دیکەش تا بەم شێوەیە بکەن.

٦- وا چاکە نەخۆشەکە دوعا بۆ غەیری خۆشی بکات چونکە ئارام دەگرێ‌و لەبارێکی دەروونی زۆر پاکدا دەبی‌و لەخوا نزیک دەبێتەوە کە تەمای قبوڵ بوون و گیرا بوونی دوعای هەیە.

٧- نەخۆش نابێ بێزاری لە نەخۆشی‌یەکەی دەرببڕی‌و بڵێ ئەوە چ بوو من چاک نەبوومەوە وە نابێ دوعای مردن لەخۆی بکات.

---

[199] البخاري مع الفتح/ ١٠/١١٨ والبخاري رقم/ ١٤٤٠ كتاب المناقب.

رواه البخاري كتاب المرضى رقم/١٨٦٩ ومسلم كتاب السلام رقم/٢١٩١

رواه مسلم ٤/١٧٢٨

ئەنەس -خوا لێی رازی بێ- دەڵێ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (**لا يتمنين احدكم الموت من ضرّ أصابه فان كان لابد فاعلاً فليقل: (اللهم أحيني ما كانت الحياة خيراً لي وتوفني اذا كانت الوفاة خيراً لي)**[202]

واتە/ کەس لە ئێوە ئاواتەخوازی مردن نەکات کە ناخۆشییەکی تووش دەبێ، ئەگەر هەرواش دەڵێ با بڵێ: خوایە بمژیێنە ئەگەر ژیانم باشترە، وە بممرێنە ئەگەر مردنم باشترە.

٨- وا چاکە ئەوەی لە ژیان بێ هیوا دەبیو دەزانێی کاتی مردنی هاتووە ئەم چەند شتە جێ بەجێ بکات:

* زۆر یادی خوا بکات بەدڵ و بەزمان سوپاسی خوا بکات و قورئان بخوێنێ.

* ئەمانەت و هەقی خەڵکی کە لەسەریەتی بیداتەوە خاوەنەکانیان.

* ئامۆژگاری ئەو کەسە بکات کە لەدوای ئەودا سەرپەرشتی خاوو خێزانەکەی دەکات.

* چاکە لە خوا ڕاببینێ (گومانی باشی -**حسن الظن**-ی هەبێ بەرامبەر بەخوای گەورە)و ئەوە بێنێتەوە یادی خۆی کە ئەو دروست کراو (مخلوق)ێکی بچوک و بێ دەسەڵاتە وە خوای گەورە پێویستی بە سزادانی ئەو نییەو چاوەڕێی چاکەو لێ بووردەیی خوا بکات و تەنها چاو ببڕێتە ڕەحمی ئەو، ئەوەش وەبیر خۆی بێنێتەوە کە هەر یەکێک لە دڵەوە بە نیخلاسەوە بڵێ: لا اله الا الله ئەوا دەچێتە بەهەشت وە کە گەیشتە سەرەمەرگیش ئەوە بڵێ کە پێغەمبەرﷺ دەیفەرموو: (**اللهم اغفر لي وارحمني والحقني بالرفيق الاعلى**)[203]

واتە/ خوایە لێم خۆش ببەو ڕەحمم لەگەڵدا بکەو بم گەیەنە بە خواناسە چاکەکان لە پێغەمبەرو صدیق و شەهیدو پیاوچاکان.

---

[202] رواه البخاري ومسلم.

[203] البخاري ١٠/٧٤ ومسلم ٤/١٨٩٣ والترمذي.

# وانەی شەشەم:

# ئادابی دەرماڵ

## أ- چوونە دەر لە ماڵ:

١- کاتێک لەماڵ دەرچویت مۆڵەت بخوازەو ماڵ ئاوایی بکەو ئەو شوێنەیان پێ بڵێ کە بەنیازی بۆی بچی، مەگەر نەشێ شوێنەکە بگۆترێ.

٢- پێش ئەوەی لەماڵ دەرچیت خۆت گورج و گۆڵ بکەو لە ڕێگەی ئاوێنەوە عەیب و کەم و کوڕییەکانت چاک بکە تا شێوەی جل و بەرگ و دیمەن و دەم و چاوو سەرو ڕیشت ئاڵۆزو ناڕێک نەبێت.

٣- لەکاتی چوونە دەر لە ماڵ پێویستە بڵێ: **(بسم ا لله توکلت علی ا لله ولا حول ولا قوة الا با لله)**[٢٠٤]

ئەنەس دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغمبەرﷺ فەرموویەتی:

هەر کەس لە ماڵەوە دەرچوو و ئەم زیکرەی خوێند کە دەریدەخات بەناوی خواوە دەردەچی‌و پشتی بەو بەستوەو هیچ هێزێک و هەوڵێک بەکەڵک نایەت ئەگەر کۆمەک و پشتیوانی خوای لەگەڵدا نەبێت ئەوا پێی دەگوترێ: ئەمە بەستەو پارێزراوی‌و هیدایەت دراوی وە ئەو شەیتانەش کە تەرخان کراوە بۆ فریودانی لێی دەکشێتەوە دواوەو بە شەیتانێکی تر دەڵێت: چۆن دەتوانی کەسێک لە خشتە بەری کە هیدایەت درابی‌و پێویستی پێ درابی‌و پارێزرابێ؟

* لە ئوم سەلەمەوە دەگێڕنەوە کە گوتویەتی: پێغەبمەری خواﷺ هەر کاتێک لە ماڵی من چووبێتە دەرەوە چاوی بۆ ئاسمان بەرز کردۆتەوەو فەرموویەتی **(بسم ا لله توکلت علی ا لله لا حول ولا قوة الا با لله، اللهم اني اعوذ بك ان أَضل أو اضل أو ازل او ازل، أو أظلم أو**

---

رواه ابو داود ٤/٥ ٣٢٥ والترمذي/د/ ٤٩٠ وانظر صحيح الترمذي ٣/ ١٥١

اظلم، أو اجهل أو يجهل عليّ)[٢٠٥]

واتە/ بەناوی خوا پشتم بەخوا بەستوە، هیچ هەولێكێ و هێزو توانایەكێ كەڵكی نیيە بەكۆمەكی خوا نەبێت، خوايە پەنا دەگرم بەتۆ لەوەی كە گومڕاو سەر لێ شێواو بم یان خەڵكی گومڕا كەم، یان خەڵكی لە خشتە بەرم یان لە خشتە ببرێم، یـان ستەم بكـەم یـان ستەمم لـێ بكرێت، یان نەزانیو نەفامی بكەم یان نەفامیو نەزانیم لەگەڵدا بكرێت.

٤- سەیری گیرفان و جێگاو ماڵ بكە نەوەكێ شتێكی گرنگێ و پێویستت لەبیر چووبێت و لێت كەوتبێت یان دەرگاو پەنجەرەكانت دانەخستبیو ئاوەڵەو كراوەبن و كلیلكانیش هەر لەوێ بن.

٥- هەموو ئەو شتانەی ئاگریان لێ دەبێتەوە بیان كوژێنەوە تاوەكو دوای دەرچوونت لـەماڵ ئاگر ماڵت وێران نەكات.

## ب- چوونە ماڵەوە:

١- لە ئەبو مالكی ئەشعەری -خوا لیّی ڕازی بێت- دەگێڕنـەوە گوتوویـەتی: پێغەمبـەری خواﷺ فەرموویـەتی: (اذا ولج الرجـل بيتـه فليقـل: اللهـم انـي أسـألك خـير المولج وخـير المخرج، باسم ا لله ولجنا وباسم ا لله خرجنا وعلى ا لله ربنا توكلنا) ثم يسلم على اهله[٢٠٦]

واتە/ ئەگەر كەسێكێ چووە ماڵەوە با بڵێ: (خوایە گیان داوای چاكەی چوونە ماڵ و لەماڵ دەرچوونت لێ دەكەم، بەناوی خوا چووینە ژوورەوەو بەناوی خواوە لەماڵ دەرچووین وە پشـتمان تەنها بە پەرستراوو خوای خۆمان بەستووە، دوایی با سەلام لە ماڵ و منداڵ و كەس و كارەكەی بكات.

٢- لەكاتی چوونە ماڵدا ئەو دوعایانە بكە كە لە پێغەمبەرﷺەوە هاتوون سڵاو (سـلام) لە ئەندامانی خـێزان بكـە، ئەنـەس -خـوا لێـی ڕازی بـێ- دەگێڕێتـەوە دەڵـێ: پێغەمبـەرﷺ فەرموویەتی: (يا بنيّ اذا دخلت على اهلك فسلم تكن بركة عليك وعلى أهل بيتك)[٢٠٧]

واتە/ فەرمووی بە ئەنەس: كوڕەكەم كە چوویتە ماڵـەوە لای كـەس و كـارت سـەلام بكـەو

---

روان اهل السنن وقال الترمذي حديث حسن صحيح وانظر صحيح الترمذي ١٥٢/٣ وصحيح ابن ماجه ٣٣٦/٢

اخرجه ابو داود باسناد صحيح ٣٢٥/٤

رواه الترمذي وقال. حديث صحيح.

کەمیتە لەرو پیرۆزیو دەرژێ بەسەر خۆت و کەس و کارتدا، بەڵام ئەگەر موسڵمان چووە مـاڵی خۆیو کەسی تێدا نەدی یان لەماڵ نەبوون با بەم شێوەیە سەلام بکـات: (السـلام علینـا وعلـی عباد ا لله الصالحین).

هەروەکو خوای دەفەرموێت: ﴿فـاذا دخلتـم بیوتـاً فسـلموا علـی انفسـکم تحیـة مـن ا لله مبارکة طیبة﴾[٢٠٨]

واتە/ ئەگەر چوونە ماڵێکەوە سەلام لە خۆتان بکەن، سەلامێکی باش و پیرۆزو پاک لەلای خوای گەورە.

٣- کت و پڕو بێ مۆڵەت وەرگرتـن و ئاگادارکردنـەوەی دانیشـتوانی مـاڵ خـۆت بـەژووردا مەکە..

٤- لـەکاتی تـەنیاییو چۆڵـیدا هەسـت بـە چـاودێری خـوای گـەورە بکـەو سـنووری حـەرام مەبەزێنە.

٥- خۆت بەدوور بگرە لەزۆر دەنـگ بـەرز کردنـەوەو یـاری هەراسـان کـەر چونکـە ئەمانـە ئازاری دراوسێ (جیران) دەدەن.

٦- لەکاتی حەوانەوەو خەوتندا دەنگی ڕادیۆو تەلەفزیۆن و.... هتد بڵندو بەرز مەکەوە.

٧- دوور بکەوە لەسەیر کردن و گوێ گرتن لەو شتانەی کە دروست نین بۆ موسڵمان چونکە خوا دەفەرموێت: ﴿ان السمع والبصر والفؤاد کل اولئك کان عنه مسئوولاً﴾[٢٠٩]

واتە/ بێ گومان گوێو چاوو دڵ هەموو ئەوانە پرسینەوەیان لەسەرە.

٨- لەکاتی خۆگۆڕین و چوونە سەر ئاوو خۆشوردندا خۆت داپۆشەو شەرمگە (عـەورەت)ت دەرمەخە، شەرم و شکۆ لە دانیشتن و خەوتندا بپارێزەو لە شەرمگەی کەسانی تر مەڕوانە. ابن عباس -خوا لێی رازی لـێ- لـە پێغەمبـەرەوەﷺ دەگێڕێتـەوە کـە فەرموویـەتی: (نهیت ان امشي عریاناً)[٢١٠]

واتە/ لێم قەدەغە کراوە بەرووتی بەرێگەدا بڕۆم.

---

[٢٠٨] النور/٦١

[٢٠٩] الاسراء/٣٦

[٢١٠] رواه الطبراني.

٩- به خانوو بەرەو ماڵەکە رازی ببەو ناشکوری دەرمەبڕە، ئەوەت لەیاد بێت کە چەندەها خەڵکی تر هەیە شوێنێکیان نییە لەسەرماو گەرما بیانپارێزێت، عبداللەی کوڕی عومەر- خوا لێیان رازی بێ- دەگێڕێتەوە پێغەمبەرﷺ کە ئێواران دەگەڕایەوە ماڵ دەیفەرموو: (الحمد لله لذي كفاني وآواني والحمد لله الذي اطعمني وسقاني والحمد لله الذي منّ عليّ اسألك ان تجيرني من النار)[211]

واتە/ سوپاس بۆ ئەو خوایەی تەمەنی پێ ڕەوا دیتم و حاواندمیەوە وە سوپاس بۆ ئەو خوایەی خواردن و خواردنەوەی پێ بەخشیم، وە سوپاس بۆ ئەو خوایەی منەتی زۆری بەسەرمەوە هەیە، خوایە داوات لێ دەکەم بمپارێزی لە ئاگری دۆزەخ.

١٠- گرنگی بە کەل و پەل و ڕاخەری ماڵەکەت بدە، هەرکات پێویستی بەچاک کردن و دەست لێدانی هەبوو چاکی بکەوەو پشت گوێی مەخە تا خراپتر نەبێت.

١١- پیس و پۆخلی قبوڵ مەکەو ماڵەکەت پاک و خاوێن ڕاگرەو لە خزمەت کردنیدا بەشداری بکە.

(عن الاسود بن يزيد النخعي –رحمه الله– قال: سألت عائشة (رضي الله عنها) ما كان رسول اللهﷺ يصنع في بيته؟ قالت: يكون في مهنة (حوائج أهله وخدمتهم) فاذا حضرت الصلاة يتوضأ ويخرج الى الصلاة)[212]

واتە/ لە ئەسوەدی کوڕی یەزیدەوە دەڵێت لە خاتوو عائشەی خێزانی پێغەمبەرﷺم پرسی: ئایا پێغەمبەرﷺ لە ماڵەوە چۆنە؟ چی دەکات؟ فەرمووی: لە ماڵەوە خزمەت دەکات و بەدەمیانەوە دێت و یارمەتیمان دەدات، وە کە کاتی نوێژیش هات دەست نوێژ دەگرێت و ئنجا دەڕوات بۆ مزگەوت.

١٢- نهێنی ماڵەکەت بپارێزەو لای کەس باسی مەکە چونکە موسڵمان بەدرکاندنی نهێنی ناو ماڵی ڕێزی خۆی کەم دەکاتەوەو متمانەی نامێنێت.

---

[211] رواه ابن السني.

[212] رواه البخاري.

# وانەی حەوتەم:

# ئادابی ئاو خواردنەوە

١- لە سەرەتادا ناوی خوا بێنیٚ بڵیٚ (بسم الله)[٢١٣]

٢- بە دانیشتنەوە ئاو بخواتەوە، چونکە بۆ تەندروستی لەش چاکترەو بە ئەدەب ترە، ئەبو سەعیدی خودری -خوا لێی رازی بێ- دەڵیٚ: (ان النبيﷺ نهى عن الشرب قائماً)[٢١٤]

واتە/ پێغەمبەرﷺ نەهی کردووە لە خواردنەوەی ئاو بەپێوە.

بەڵام (ابن عباس) دەڵیٚ: (شرب النبيﷺ قائماً من ماء زمزم)[٢١٥]

واتە/ پێغەمبەرﷺ بەپێوە ئاوی زەمزەمی خواردۆتەوە.

هەروەها ابن عمر دەڵیٚ: (كنا نأكل على عهد رسول اللهﷺ ونحن نمشي ونشرب ونحن قيام)[٢١٦]

واتە/ ئێمە لە سەردەمی پێغەمبەرداﷺ بە رۆیشتنەوە نانمان دەخواردو ئاویشمان بەپێوە (هەڵسانەوە) دەخواردەوە.

جا زانایان دەڵێن: نەهیەکە بۆ کەراهەتە نەک بۆ تەحریم، ئاو خواردنەوەی پێغەمبەرﷺ بەپێوە بۆ ئەوە بووە ئوممەتەکەی بارگران نەکات و کاریان لەسەر قورس نەکات.

ئنجا باشتر وایە لەکاتە ئاساییەکاندا بە دانیشتنەوە ئاو بخۆینەوە، بەڵام ئەگەر ناچار بوویو نەگونجا بە دانیشتنەوە بخۆیتەوە ئەوا ئاساییە (والله اعلم) بە پێوەو بەهەستانەوە ئاو بخۆیتەوە.

٣- کە ئاوگێڕ بووی لەلای ڕاستەوە دەست پیٚ بکەو بەدەستی ڕاست ئاو بدە بەمیوانەکان

---

[٢١٣] رواه الطبراني باسناد حسن.

[٢١٤] رواه احمد ومسلم.

[٢١٥] البخاري رقم/١٨٥٠ ومسلم رقم/٢٠٢٧

[٢١٦] رواه احمد وابن ماجه والترمذي.

خۆشت بەدەستی ڕاستە جامەکە بگرەو بیخۆرەوە چونکە خاتوو (**حفصة**) -ڕەزای خوای لێ بێ- دەڵێ: (**ان رسول الله ﷺ كان يجعل يمينه لطعامه وشرابه وثيابه ويجعل يساره لما سوى ذلك**)[217]

واتە/ پێغەمبەرﷺ دەستی ڕاستەی بۆ خواردن و خواردنەوەو جل و بەرگی بەکار دەهێنا و دەستی چەپیش بۆ شتانی دی.

هەروەها کە ئاوگێڕ بیت دەبێ لە کۆتایی خەڵکەوە ئاو بخۆیەوە چونکە قتادە دەڵێ: پێغمبەرﷺ فەرمووی (**ساقي القوم آخرهم شرباً**)[218]

واتە/ ئاوگێڕ لە کۆتایی خەڵکەکەوە ئاو دەخواتەوە.

٤- چاکترین ڕێگا بۆ ئاو خواردنەوە هەڵقۆراندنی ئاوەکەیە یان هەڵگوشینی نەک ڕژاندنە ناو قوڕگ.

٥- بە سێ جار ئاوەکە بخۆوەو لەهەر جارێکیشدا هەناسەیەک لەدووری جامەکە بدەوە. ابن عباس -خوا لێی رازی بێ- دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (**لا تشربوا نفساً واحداً كشرب البعير ولكن اشربوا مثنى وثلاث وسموا اذا انتم شربتم واحمدوا الله اذا انتم رفعتم**)[219]

واتە/ وەک حوشتر (وشتر) ئاو مەخۆنەوە، بینی پێوە بنێن بەیەکجار!! بەڵکو بە دوو جار یان سێ جار بیخۆنەوە وە ناوی خوا بێنن کاتێ ئاو دەخۆنەوە، وە سوپاسی خوا بکەن کە لێ دەبنەوە.

ئنجا ئەوەش ڕاستە کە لە جاری یەکەمدا (بسم الله)بکات و لەجاری ئاخیردا کە لێ بووەوە ستایشی خوا (الحمد لله) بکات، هەروەها ئەوەش ڕاستە کە لەگەڵ هەر جارێکدا بسم الله و پاشان الحمد لله بکات.

٦-هەوڵ بدە ئاوەکە هەر بەپاکی بمێنێتەوەو شتی پیس و خڵتەی تێ نەکەوێت،

---

[217] رواه ابو داود والترمذي.

[218] رواه الترمذي وقال حديث حسن

[219] رواه الترمذي وهو حديث حسن

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ:(**غطوا الاناء- الطعام- واوكوا السقاء...**)[220]

واتە/ خواردن و خواردنەوەکانتان داپۆشن و سەریان بگرن.

٧- هەناسە مەکە ناو جامی ئاوەکەو فووی تێ مەکە، گەر خڵتەیەکت دیت لەناو ئاوەکەدا ئاوەکە برژێنە تاوەکو خڵتەکە فڕێ دەدات چونکە نابێ بە هەناسەو فوو لێ کردن فڕێی بدەی، ابو قتادە دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (**اذا شرب احدكم فلا يتنفس في الاناء**)[221]

واتە/ ئەگەر ئاوتان خواردەوە فوو و هەناسە مەکەنە ناو قاپ و جامی ئاوەکە.

ئەبو سەعیدی خودری دەڵێ: پێغەمبەرﷺ نەهی لەوە کردوە فوو بکرێتە ناو جامی ئاو خواردنەوە، پیاوێکیش گوتی: ئەدی ئەگەر شتێکی پیسی تێدا بوو؟ فەرمووی: (**أهرقها**)[222] واتە: بیرێژە.

٨- لە پەرداخ وشتی ئەوادا ئاو بخۆوە نەک لە لولەی مەسینەو گۆزەو کوندە... ئەوەش بۆ ئەوەی دڵنیابین لە پاک و خاوێنی ئاوەکەو جام و دەفرەکەش پیس نەبێت، چونکە کەسانی دیش لێی دەخۆنەوە.

ئەبو هورەیرە -خوا لێی رازی بێ- دەڵێ: (**نهى رسول الله ﷺ ان يشرب من في السقاء او القربة**)[223]

واتە/ پێغەمبەرﷺ نەهی لەوە کردوە ئاو لە دەمیلە (لولە)ی دەفرو جامی ئاو بخورێتەوە.

٩- بە هێواشیو لەسەرخۆیی ئاوەکەت بخۆوەو پەلەی لێ مەکەو دەنگە دەنگیش مەکە لەکاتی ئاو خواردنەوە.

١- لە دەفرو پەرداخی زێرو زیودا ئاو نەخۆیەوە چونکە ئەمە حەرامەو تەکەبورو زێدە ئیسرافی تێدایە، ئەبو حوزەیفە -خوا لێی رازی بێ- دەڵێ: (**ان النبيﷺ نهانا عن الحرير**

---

[220] رواه مسلم.

[221] متفق عليه

[222] رواه احمد والترمذي.

[223] متفق عليه.

**والديباج والشرب في آنية الذهب والفضة وقال هي لهم في الدنيا وهي لكم في الآخرة)**[٢٢٤]

واته/ پێغەمبەرﷺ نەهی لێ کردووین کە ئاوریشم (حریر)و دیباج بکەینە جل و بەرگمان وە هەروەها لەوەش کە لە دەفرو پەرداخ و قاپی زێڕو زیودا ئاو بخۆینەوە، فەرمووی: ئەوەشتانە لە دنیادا بۆ بێ باوەڕانەو لەدوا ڕۆژیشدا بۆ ئێوەیە.

١١- ئەو ئاوەی کە بۆت تێ دەکرێ هەمووی بخۆوە هیچی تێدا مەهێڵەوە بۆیە دەبێ هەر لە سەرەتاوە چەندەت بۆ دەخورێتەوە ئەوەندەش بکەیە ناو دەفرو پەرداخەکەوە.

١٢- ئنجا کە ئاوەکەت خواردەوە سوپاسی خوا بکەو بڵێ: **(الحمد لله الذي جعله عذباً فراتاً برحمته، ولم يجعله ملحاً اجاجاً بذنوبنا)**[٢٢٥]

واته/ سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە ئەم ئاوەی پاک و شیرین و زۆر بەتام و تینوشکێن کردووە بە بەزەیی خۆی، وە نەیگێڕاوە بە خوێیەکی زۆر تاڵ و سوێر بەهۆی گوناهەکانی ئێمەوە.

وە پێویستە دوعا بۆ ئاوگێڕەکەیش بکەیو بڵێی: **(اللهم اطعم من اطعمني واسق من سقاني)**[٢٢٦]

واته: خوایە خواردن بدەیتە ئەو کەسەی خواردنی دەرخوارد دام، وە ئاو بدەیتە ئەو کەسەی کە ئاوی دەرخوارد دام.

---

[٢٢٤] متفق عليه.

[٢٢٥] اخرجه الطبراني.

[٢٢٦] رواه مسلم ١٢٦/٣

# وانەی هەشتەم:

# هەندێک لە ئاداب و خوورەوشتی گشتی

١- ئایا لەکاتی لەبەرکردنی پۆشاکدا چی دەڵێین؟

وەڵام/ دەڵێین: (الحمد لله الذي كساني هذا الثوب ورزقنيه من غير حول مني ولا وقوة)[٢٢٧]

واتە/ سوپاس بۆ ئەو خوایەی بەم پۆشاکە داپیۆشیوم و پێی بەخشیوم بەبێ هەوڵ و کۆشش و توانای خۆم.

٢- ئایا لەکاتی لەبەرکردنی بەرگی تازەدا چی دەڵێین؟

وەڵام/ دەڵێین: (اللهم لك الحمد أنت كسوتنيه، أسألك من خيره وخير ما صنع له، واعوذ بك من شره وشر ما صنع له)[٢٢٨]

واتە/ خوایە سوپاس هەر بۆ تۆیە، خۆت بەم پۆشاکە پۆشتەت کردووم ئەوە داوات لێ دەکەم لە خێرو چاکەی ئەو بەرگەو خێرو چاکەی ئەوەشی کە بۆی دروست کراوە، وە پەنات پێ دەگرم لە شەڕو خراپەی‌و شەڕو خراپەی ئەوەشی کە بۆی دروست کراوە.

٣- ئایا چی دەڵێین بەو کەسەی پۆشاکی تازەو نوێ لەبەر دەکات؟

وەڵام/ دەڵێین: (البس جديداً وعش حميداً، ومت شهيداً)[٢٢٩]

واتە/ بەرگی تازەو نوێ لەبەر بکەو بە سوپاس کراوی بژی‌و بە شەهیدی‌و بەختیاری بمرەو سەربنێوە.

---

[٢٢٧] اخرجه اهل السنن الا النسائي انظر [illegible] العليل ٤٧/٧ وقال الحاكم صحيح على شرط البخاري

ابو داود والترمذي والبغوي وانظر مختصر شمائل الترمذي للألباني ص٤٧

رواه بن ماجه ١١٧٨/٢ والبغوي ١٢ ٤١ انظر صحيح بن ماجه ٢ ٢٧٥

٤- ئایا لەکاتی دانان و داکەندنی بەرگ و پۆشاکدا دەڵێین چی؟

وەڵام/ دەڵێین: (**بسم الله**)[٢٣٠]

واتە/ بەناوی خوای پەرستراوی ڕاستەقینە.

٥- ئایا کاتێک ترساین لە زاڵم و دوژمنان و پێیان گەیشتین دەڵێین چی؟

وەڵام/ دەڵێین: (**اللهم انا نجعلك في نحورهم ونعوذ بك من شرورهم**)[٢٣١]

وتە/ خوایە ئێمە تۆ دەکەین بەگژیانداو دەتخەینە سەنگەریان وە پەنا دەگرین بەتۆ لە شەڕو خراپەیان.

٦- ئایا لەکاتی پرسەو سەرەخۆشیدا چی دەڵێین؟

وەڵام/ دەڵێین: (**ان لله ما أخذ، وله ما اعطى، وكل شيء عنده بأجل مسمى، فلتصبر ولتحتسب**)[٢٣٢]

ئوسامەی کوڕی زەید دەگێڕێتەوە: کە کچێکی پێغەمبەرﷺ دەنێرێتە لای پێغەمبەرﷺ کەوا کوڕێکمان مردووە، وەرە بۆ لامان، نێرراوێکی نارد سەلامی پێ بگەیەنێو بڵێ: (ئەوەی خوا دەیباتەوە هێ خۆیەتی، وە ئەوەش کە دەیبەخشێ هەر هی خۆیەتی، وە هەموو شتێک بەلای ئەوەوە ماوەیەکی دیاری کراوی هەیە جا ئارام بگرەو بەتەمای پاداشتی چاکەی لای خوا بە.

تێ بینی: سەرنج دەدەین پێغەمبەری خواﷺ کوڕی کچێکی دەمرێ تەنها ئەم پرسەو سەرەخۆشی لێ کردنەی بۆ دەنێرێ، بەڕاستی جێگەی داخە ئەمڕۆ موسڵمانان گەلێک درێژە بەم مەسەلەیە دەدەن و کارو کاتی زۆر تێدا بە فیڕۆ دەدەن...!! هێوا دارین وردە وردە لێی کەم بکرێتەوەو زیاتر زیادەی نەخرێتە سەر ئەمەش کارێکی چاکەو هەر لە موسڵمانانی دڵسۆزو بەخەمەو دەوەشێتەوەو چاوەڕوان دەکرێت کە بتوانن شتی بێ سوود یان زیان بەخش و هەڵبەستراو لە نێوانیاندا هەڵ گرن و بەلای چاکەدا بیگۆڕن. ئنجا زانایان گوتویانە: ئەگەر

---

رواه الترمذي ٢/٥٠٥ وغيره وانظر الارواء برقم ٤٩ وصحيح الجامع ٣/٢٠٣

رواه ابو داود ٢/٨٧ وانظر صحيح ابن ماجه ٢/٣٣٥

رواه البخاري ٢/٨٠ ومسلم ٢/٦٣٦

موسڵمان سەرەخۆشی لە موسڵمان کرد بۆ مردنـی موسـڵمانێک بـا بڵـێ: **(اعظم الله اجرك واحسن عزاءك وغفر لميتك).**

واتە/ (خوا پاداشتی زۆرت بداتەوەو بەچاکی دڵ خۆشیت بداتەوەو لە مردووەکەشت خـۆش ببێ).

وە ئەگەر سەرەخۆشی لە موسڵمانێک کرد بۆ مردنی کافرێک با بڵێ:

**(اعظم الله اجرك واحسن عزاءك).**

وە ئەگەر سەرەخۆشی کرد لە کافرێک بۆ مردنی موسڵمانێک با بڵێ:

**(احسن الله عزاءك وغفر لميتك).**

وە ئەگەر سەرەخۆشی کرد لە کافرێک بۆ مردنی کافرێک با بڵێ:

**(أخلف الله عليك).**

واتە/ خوا شوێنەکەیت بۆ پڕ بکاتەوە.

وە ئەوەی سەرەخۆشی لێ دەکرێ با بڵێ: (آمین) وە بەو کەسەی سەرەخۆشی لێ دەکـات بـا بڵێ: **(آجرك الله)** خوا پاداشتت بداتەوە.

٧- ئایا لەکاتی سەردانی گۆڕستاندا چی دەڵێین؟

وەڵام/ دەڵێین: **(السلام عليكم أهل الديار من المؤمنين والمسلمين وانا ان شاء الله بكم لاحقون نسأل الله لنا ولكم العافية)**[٢٣٣]

واتە/ سەلامتان لێ بێت خەڵکی گۆڕستان لە بڕوادارو موسڵمانان وە ئێمە بە ویستی خـوا (انشاء الله) پێتان دەگەینەوە.

وە داوای ڕزگاریو لێ خۆشبوون بۆ خۆشمان و بۆ ئێوەش لەخوا دەکەین.

٨- ئایا لەکاتی پیرۆزبایی‌و ژن هێناندا دەڵێین چی؟

وەڵام/ دەڵێین: **(بارك الله لك وبارك عليك وجمع بينكما في خير)**[٢٣٤]

واتە/ خوا فەڕو پیرۆزی بڕژێنێ بۆت وە فەڕو پیرۆزی بڕژێنێ بەسەرتاو لەسـەر خـەیرو چاکـە کۆتان بکاتەوە..

---

[٢٣٣] رواه مسلم ٢/٦٧١ واحمد وغيرهما

اخرجه اصحاب السنن الا النسائي وانظر صحيح الترمذي ١/٣١٦

٩- ئایا لەکاتی تووڕەبووندا دەڵێین چی؟

وەڵام/ دەڵێین **(اعوذ با لله من الشيطان الرجيم)**[٢٣٥]

اتە/ پەنا دەگرم بەخوا لە شەیتانی دوور خراوە لەبەزەیی خواو نەفرین لێ کراو.

١٠- ئایا کاتێک ترساین لە هاوبەش بڕیاردان بۆ خوا دەڵێین چی؟

وەڵام/ دەڵێین **(اللهم اني اعوذ بك ان اشرك بك وانا اعلم واستغفرك لما لا اعلم)**[٢٣٦]

واتە/ خوایە پەنا دەگرم بەتۆ کە هاوەڵت بۆ بڕیار دەم و پێشی بزانم وە داوای لێ خۆشبوونت لێ دەکەم لەوەی کە پێی نازانم.

١١- ئایا کاتێک کە چووینە بازاڕ دەڵێین چی؟

وەڵام/م دەڵێین **(لا اله الا ا لله وحده لا شريك له له الملك وله الحمد يحيي ويميت وهو حي لا يموت بيده الخير وهو على كل شيء قدير)**[٢٣٧]

واتە/ (هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نییە جگە لە (ا لله) کە تاک و تەنهایەو هاوەڵی نییە، سەروەت و سامان و سوپاسی ڕاستەقینە هەر بۆ ئەوە زیندوو دەکاتەوەو دەمرێنێو خۆی زیندووی نەمرە، خێرو چاکە تەنها بەدەستی ئەوە وە هەر خۆی دەسەڵاتی تەواوی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.

١٢- ئایا (لەکاتی سەفەردا) دەڵێین چی؟

وەڵام/ دەڵێین: **(استودعكم ا لله الذي لا تضيع ودائعه)**[٢٣٨]

واتە/ بەو خوایەتان دەسپێرم کە سپاردەکەی خۆی ون ناکات.

١٣- ئایا لەکاتی خواحافیزکردنی ڕێبوارێکدا دەڵێین چی؟

وەڵام/ دەڵێین: **(استودع ا لله دينك وامانتك، وخواتيم عملك)**[٢٣٩]

واتە/ بەخوا دەسپێرم دین و ئەمانەت و کۆتاییەکانی کردەوەت.

١٤- ئایا لەکاتی پژمینی بێ باوەڕێکدا دەڵێین چی؟

---

رواه البخاري ٧/٩٩، ومسلم ٤/٢٠١٥

[٢٣٦] رواه احمد ٤/٤٠٣ وغيره وانظر صحيح الجامع ٣/٢٣٣ وصحيح الترهيب والترغيب للألباني ١/١٩

[٢٣٧] رواه الترمذي ٥/٤٩١ والحاكم ١/٥٣٨ وانظر صحيح الترمذي ٢/١٥٢

[٢٣٨] رواه احمد ٢/٤٠٣ وابن ماجه ٢/٩٤٣وانظر صحيح ابن ماجه ٢/١٣٣

[٢٣٩] رواه احمد ٢/٧ والترمذي ٥/٤٩٩ وانظر صحيح الترمذي ٢/١٥٥

وەڵام/ (**يهديكم ا الله ويصلح بالكم**)[240]

واتە/ خوا هیدایەت و ڕێنماییتان بکات و حاڵتان چاك بکات.

١٥- ئایا لەکاتی وەڵامدانەوەی سەلامی بێ باوەڕێکدا دەڵێین چی؟

وەڵام/ دەڵێین: (**وعليكم**)[241]

واتە/ لەسەر خۆتان بێت.

١٦- ئایا لەکۆتایی هەموو کۆڕو مەجلیسێکدا دەڵێین چی؟

وەڵام/ دەڵێین/ (**سبحانك، وبحمدك لا اله الاّ أنت استغفرك واتوب اليك**)[242]

واتە/ پاکی وبێ عەیبی بۆ تۆیە خوایە، وە سوپاسیش هەر بۆ تۆیە هیچ پەرستراوێکی بەڕاستی نی یە جگە لەتۆ، داوای لێ خۆشبونت لێ دەکەم وە هەر بۆ لای تۆش دەگەڕێمەوەو پەشیمان دەبمەوە.

١٧- ئایا لەبری کەفارەتی کۆڕو مەجلیسدا دەڵێین چی؟

وەڵام/ دەڵێین: (**سبحانك اللهم وبحمدك، اشهد ان لا اله الا انت استغفرك واتوب اليك**)[243]

واتە/ پاك و بێ گەردی بۆ تۆیە ئەی خوایە وە سوپاسیش هەر بۆ تۆیە شایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نی یە تەنها تۆ نەبێت داوای لێ خۆشبونت لێ دەکەم و بۆ لای تۆش پەشیمان دەبمەوەو دەگەڕێمەوە.

١٨- ئایا لەکاتی سواربووندا دەڵێین چی؟

وەڵام/ دەڵێین: [**بسم ا الله، الحمد لله، (سبحان الذي سخر لنا هذا وما كنا له مقرنين وانا الى ربنا لمنقلبون) (الحمد لله، الحمد لله، الحمد لله، ا الله اكبر، ا الله اكبر، ا الله اكبر، سبحانك اللهم اني ظلمت نفسي فاغفر لي فانه لا يغفر الذنوب الا انت)**][244]

---

رواه الترمذي ٥/٨٢ واحمد ٤ ٤٠ وابو داود ٤/٣٠٨ وانظر صحيح الترمذي ٢/٣٥٤

رواه البخاري مع الفتح ١١/٤٢ ومسلم ٤/١٧٠٥

[242] اخرجه النسائي في عمل اليوم والليلة ص٢٧٣ والامام احمد في المسند ٦/٧٧ قال الدكتور فاروق حمادة هذا الاسناد صحيح.

اخرجه اصحاب السنن وانظر صحيح الترمذي ٣/١٥٣

رواه ابو داود ٣/٣٤ والترمذي ٥٠١ وانظر صحيح الترمذي ٣ ١٥٦

# وانەی یەکەم:

## ﴿وما خلقت الجن والانس الاّ ليعبدون﴾ الذاريات/٥٦

واتە/ (خوای گەورە دەفەرموێ پەری (الجن)و مرۆڤـم دروست نەکردووە تەنها بۆ ئەوە نەبێت کە بم پەرستن و عیبادەتکاریم بۆ بکەن، نەک لەبەر ئەوەی کە ئاتاجیو پێداویستیم پێیان هەیە، هەروەها بۆیە دروستم کردوون کە دان بە پەرستنی من دا بنێن جا پێیان خۆش بێ یان نا).

ئەم دەقە کورتە لەناوەرۆکیدا حەقیقەتێکی گەورەی گرتۆتە خۆی، کە یەکێکە لە مەزنترین حەقیقەتەکانی بوونەوەرو بەبێ دەرک کردن و دڵنیابوون لەم حەقیقەتانە ژیانی مرۆڤ لەسەر زەویدا لەنگەر دەگرێ، یەکەمین لایەنیش لە لایەنە گرنگەکانی ئەم حەقیقەتە بوونی مەبەستێکی دیاری کراوە لە بوون (وجود)ی پەریو ئادەمیزاددا. ئەم لایەنەش لە ئەرکێکدا خۆی دەنوێنێ کە هەر یەکێک بە تەواوی پێی هەستا ئەوا دەگاتە وەدەست هێنانی مەبەستی بوونی خۆی، ئەوەی کە تێیدا کەم و کوڕی کرد یان پشتی تێ کرد ئەوە مەبەستی بوونی خۆی بەتاڵ دەکاتەوەو بێ ئەرک و پیشە دەمێنێتەوەو ژیانی لە هەموو ئامانجێک خاڵی دەبێت و مانا بنچینەیی‌یەکەی نامێنێ، ئەو ئەرک و پیشەیەی کە پەریو ئادەمیزاد بەنهێنی بوون (وجود) پەبوەست دەکات بریتی‌یە لە عیبادەتکاریو خواپەرستیو بەندایەتی کردن بۆ خوا، بە شێوەیەک کە بەندە (عبد)و پەروەردگار (رب) هەبێ، بەندەیەک بپەرستیو پەروەردگارێک بپەرستریو تەواوی ژیانی بەندە لەسەر ئەم لێکدانەوەیە لەنگەر بگرێ.

چونکە هەرخوای گەورە بەدی هێنەرو پەروەردگارەو هەر ئەوە تاکە پەرستراوە هەر خوا خاوەنی بوونەوەرو ڕۆزیو مردن و ژیانی بەدەستە زەرەرو زیان هەر بە پێی ویستی خوایەو هەر ئەویش ئەمرو نەهیو حوکمڕانی بەدەستە، حەڵاڵ و حەرام کردنیش هەر بۆ خوایە ﴿الا له الخلق والأمر﴾[٢٤٥]

---

[٢٤٥] الاعراف/٥٤

واته/ (دروست کردنی هەموو بوونەوەر بەدەست خوایەو هەموو فەرمانەکانی دروست کردن و پێکهێنان و ئەحکامەکانی شەریعەتیش هەر بەدەستی ئەوە).

هەروەها خوای گەورە باس لە نەزانی هاوەڵ بڕیاردەرەکان (المشرکین) دەکات کاتێک کە دان بە پەروەردگارێتی (**ربوبیة**) خوا دادەنێن و بەڵام پابەندبوونیان بەم دان پێداهێنانە نییەو دان بە خواوەندێتی (**ألوهیة**) خواو بەتەنیا پەرستنیدا نانێن، وە ئەم باسە لە چەندین ئایەتی قورئانی پیرۆزدا هاتووە، هەروەک دەفەرموێ:

**﴿قل لمن الارض ومن فیها ان کنتم تعلمون، سیقولون لله قل أفلا تذکرون، قل من رب السموات السبع ورب العرش العظیم، سیقولون لله قل أفلا تتقون، قل من بیده ملکوت کل شيء وهو یجیر ولا یجار علیه ان کنتم تعلمون، سیقولون لله قل فأنی تسحرون﴾**[٢٤٦]

واتە/ (ئەی محمدﷺ! پێیان بڵێ: -بە موشریکەکانی مەککە- پێم بڵێن کێ زەوی و هەموو ئەو شتانەی سەرزەوی دروست کردوە؟ بەناچاری دەڵێن: هەمووی بۆ خوایە، پێیان بڵێ: ئەدی بۆچی بیرناکەنەوەو لەگەڵ دان پێدانانیشیان بەتەواوی خوای گەورە ناپەرستن، پێیان بڵێ: کێ پەروەردگاری هەر حەوت ئاسمانەکانەوە پەروەردگاری عەرشی مەزنە؟ دەڵێن هەر خوا، دەی پێیان بڵێ ئەدی بۆچی خۆپارێز نابن و لەگەڵ ئەم دان پیدانانەش هاوبەش بۆ خوا پەیدا دەکەن، پێیان بڵێ: کێ (ئەو هەموو مولکە پان و بەرین و گەورەیەی بە دەستە)؟ وە هەر ئەو پەنادەری هەموو کەسێکە، کەس ناتوانێ کەس لە ئازاری خوا پەنادات، دەڵێن ئەو مولک و مەملەکەت و دەستەڵاتە هەر بۆ خوایە، بڵێ: ئەدی بۆچی سپی بەڕەش دەبینن و لەگەڵ ئەوەی کە حەق ڕوون و ئاشکرایە ئێوە جگە لەخوا دەپەرستن و هەروەک جادوو سیحرو ئەفسونتان لێ کرابێ).

هەر خوای گەورە توانای هەڵس و کەوتی لە بوونەوەردا هەیەو یاساو شەرع دادەڕێژێو دروست نییە کە کەسێکی تر بکەین بە هاوبەشی لە یاسادانانداو نابێ بەندەکان شەرعێکی جگە لە شەرعی خوا قبوڵ بکەن هەروەک خوا دەفەرمووێ: **﴿أم لهم شرکاء شرعوا لهم من الدین ما لم یأذن به ا لله﴾**[٢٤٧]

---

[٢٤٦] المؤمنون/٨٤-٨٩.

[٢٤٧] الشوری/٢١

واته/ هاوبەشیان پەیدا کردوون کە یاسای وایان لە شیرک و گوناهـ بۆ داتاشیون کە هەرگیز خوا ڕێی پێ نەداون.

هەروەها دەفەرموێ ﴿ما هم من دونه من ولي ولا يشرك في حكمه احداً﴾[248]

واته/ (هەموو ئەهلی زەوی‌و ئاسمانەکان جگە لە خوای گەورە هیچ وەلی‌یەکی تریان نی‌یە و خواش هەر کارێکی بیەوێ دەیکات پرس و ڕاش بە کەس ناکات و فەرمانی لەکەس وەرناگرێ). ئەم ئایەتەی سەرەوە لە هەندێک خوێندنەوە (قراءة)دا بە ﴿ولا تشرك في حكمه احداً﴾ هاتووە بە مانای ئەوەی کە وتارێکی ئاڕاستەکراوە بۆ پێغەمبەرﷺو ئوممەتەکەی کە بەهۆیەوە نەهی ئەوەیان لێ دەکرێ کە حوکمێکی جگە لە حوکمی خواو شەرعێکی جگە لە شەرعی خوا قەبوڵ بکەن.

لە قورئانی پیرۆزدا دوو وێنەی بەرامبەرو جیاواز دەبینین:

**وێنەی یەکەم:**

وێنەی ئیماندارێکی تەسلیم بووە بۆ پەروەردگارەکەی کە گوێ ڕایەڵی فەرمانەکانی خواو پێغەمبەرﷺ دەکات هەردەم چاوەڕوانی حوکمێکی خوایە (جل جلاله) یان حوکمێکی پێغەمبەرﷺ تا بڵێ: گوێم لێ بوو گوێ ڕایەڵیم کرد، جا خوای گەورە دەربارەی ئەم پۆل و تاقمە دەفەرموێ: ﴿إنما كان قول المؤمنين اذا دعوا الى الله ورسوله ليحكم بينهم ان يقولوا سمعنا واطعنا وأولئك هم المفلحون، ومن يطع الله ورسوله ويخشى الله ويتقه فأولئك هم الفائزون﴾[249]

واته/ (پێویستە لەسەر موسڵمانان کە ئەگەر داوایەکی خواو پێغەمبەرﷺیان گوێ لێ بوو بەگوێ ڕایەڵی‌و مل بۆ کەچ کردنەوە بڵێن: فەرمانی خواو پێغەمبەری خوامان گوێ لێ بوو گوێڕایەڵی‌و تاعەتمان بۆی هەیە، هەر چەندە فەرمانەکان لە بەرژەوەندی تایبەتیشیان دانەبێ، جا ئەو کەسانە خێری دونیاو قیامەتیان بردۆتەوە).

هەر یەکێکیش گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرﷺ بی‌و لەخوا بترسی‌و پارێزگار بێ ئەوە بە نیعمەتی خۆشی دونیاو قیامەت شاد دەبێت نەک یەکێکی تر.

---

248 الكهف: ٢٦

249 النور: ٥١-٥٢

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ما كان لمؤمن ولا مؤمنة اذا قضى الله ورسوله أمرا أن يكون لهم الخيرة من أمرهم﴾[٢٥٠]

واتە/ (حەڵاڵ نییە بۆ کەسێک کە ئیمانی بەخوا هەبێ ئەگەر خوای گەورە یان پێغەمبەرﷺ فەرمانێکی دەرکرد ئەم شتێکی بەدڵی خۆی هەڵبژێرێ، بەڵکو پێویستە لەسەری ئەو کارە جێ بەجێ بکا کە لێی داوا کراوەو خۆی بخاتە بەر ئەمرو فەرمانی خوا کە بۆی هەڵبژاردووە).

وێنەی دووەم:

بریتییە لە وێنەی ئەو دووڕوو (منافق)ەی کە هەوەس و بەرژەوەندی خۆی دەپەرستیو بە شوێن ئەو شتانە دەکەوێ کە لەگەڵ ئارەزووەکانیدا رێکە، جا ئەگەر شەرع و فەرمانەکانی خوا رێک کەوتن لەگەڵ ئارەزووەکانیدا ئەوا کاریان پێ دەکات، ئەمەش لەبەر ئەوەی نا کە شەرعی خوایە، بەڵکو لەبەر ئەوەی کە گونجاوە لەگەڵ ئارەزوو بەرژەوەندییەکانی هەر کاتێکیش هەوەس و ئارەزوو و بەرژەوەندییەکانی لە کوفرێکی رووتیشدا بوون ئەوا بێ سیو دوو لێ کردن روو لە کوفرەکە دەکات، خوای گەورە لەبارەی ئەم تاقم و پۆلەش دەفەرموێ: ﴿واذا دعوا الى الله ورسوله ليحكم بينهم اذا فريق منهم معرضون، وان يكن لهم الحق يأتوا اليه مذعنين﴾[٢٥١]

واتە/ ئەگەر حوکمەکان گێڕرانەوە لای خواو پێغەمبەرﷺ ئەوا تیپێکیان پشت لە موحاکەمەکە دەکەن ئەگەر حەقیان لەسەر بێو لەگەڵ بەرژەوەندییان نەگونجێ، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە دووڕوو (منافق)ن، ئەگەر بشزانن کە حوکم بۆ ئەوان دەدرێو بە پێی بەرژەوەندی ئەوانە، ئەوا مل کەچی دەنوێنن. ئایا هۆی پشت تێ کردنەکەیان گێڕانەوەی حوکم بۆ خواو پێغەمبەرﷺ ئەو نیفاق و دەغەڵییە لەدڵیاندا دروست دەکات؟

یان شک و گومانیان هەیە لە پێغەمبەرایەتی محمدﷺ! یاخود لەوە دەترسێن کە خوای گەورەو پێغەمبەرﷺ حەق لابدەن و بیگۆڕن؟ بەڵکو هۆی سەرەکی بریتییە لە لاملیو ستەمکاریو زۆرداریان!!

---

الاحزاب ٣٦

النور ٤٨-٥٠

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ومن الناس من يعبد الله على حرف فان أصابه خير اطمئن به، وان اصابته فتنة انقلب على وجهه خسر الدنيا والآخرة ذلك هو الخسران المبين﴾[252]

واتە/: (کەسانێک هەن کە لە خوا پەرستیدا گومانیان هەیەو جێگیرو دڵ ئارام نین، جا ئەگەر خێرێکی دونیایی بێتە ڕێ، ئەوا دڵ ئارام دەبیو بەردەوام دەبێ لە عیبادەتکاریەکانی، بەڵام ئەگەر بەسەرهاتێکی ناخۆشی بەسەرهات ئەوا بەرووی خۆیدا هەڵدەگەڕێتەوەو بۆ کوفر دەگەڕێتەوە. ئەو کەسانە دونیاو قیامەتیان لەکیس چووەو هەردوو لای دۆڕاندوە، ئەم دۆڕاندنەش لە هەموو دۆڕاندنێک گەورەترو ئاشکراترە).

ئەمانەو چەندین ئایەتی تر لە باسی هەوەس پەرستان هاتووە کە بە کوێری هەنگاوەکانیان دەنێن و لە وەلائیاندا شلەژاون.

کەواتە: ئەو مرۆڤە ئیماندارەی کە شارێگەی ئیسلامەتی بەسەر کوێرە ڕێچکەکانی کوفرو نیفاقدا هەڵدەبژێرێ نابێ لەئاست فەرمان و نەهی لێ کردنی خوای گەورەدا هیچ قسەیەکی هەبێت و نابێ لەگەڵ حوکم و فەرمایشتی خوادا هیچ حوکم و قسەیەکی تر هەڵبژێرێ، بەڵکو مەسەلەکە بریتییە لە مل کەچ کردن و تەسلیم بوونێکی ڕەهاو داماڵراو (التسليم المطلق المجرد) لە هەموو هۆکارو پاڵنەرێک جگە لە گوێ ڕایەڵی خواو پێغەمبەرەکەیﷺو رازی بوون بە حوکمەکانی ئەوان، چونکە بابای بڕوادارو موسڵمان گەرەکی نییە بزانێ کە حیکمەت لە فلانە مەسەلەو فیسار کارە چییە؟ یان خراپەی فلانە شتی قەدەغەکراو چییە؟ بەڵکو تەنها دەبێ لەوە بکۆڵێتەوە کە بزانێ ئایا حوکمی خوا لە فلانە مەسەلە چییە؟ وە نیشانەو بەڵگەکانی ئەم حوکمە چین؟ پاشان زۆر بە دڵێکی ئارام و بیناییەکی ڕوونەوە شوێن حوکمەکە بکەوێت و پێی رازی بێت.

جا ئەگەر ئەم حەقیقەتە ئاشکراو ڕوونە بنچینەو کرۆکی ئیسلام بێت دەبێ بڕواداری تەسلیم بوو دەرکی ئەوەش بکات کە هەر بابەت و هەر فەرمانێکی خوا حیکمەتێکی تێدایە، ئنجا کەسانی وا هەن حیکمەتەکە دەزانن هەشیانە نایزانن جا لەوانەیە ئەو حوکمەش (واجب) بێ یا (مندوب) وەیان (مستحب)و یاخود (مکروه) یان (حرام) بێت، چونکە ئەحکامەکان هەر ئەم

---

[252] الحج ١١

پێنجەن و هیچ مەسەلەیەک لەم پێنج حوکمە دەرناچێ.

موسڵمانی باوەڕ پتەوبش هەمیشە هەوڵ دەداو تێ دەکۆشێ بۆ دەرک کردن و زانینی حوکمی خوا لەهەر مەسەلەو بابەتێک بێت، ئنجا ئەگەر زاناو شارەزا بوو ئەوا پێویستە تێکۆشێ بۆ زانینی ئەو ئەحکامانەی کە خەڵک ئاتاج (محتاج)ن بۆیان، تاکو دروست و نادروستیان پیشان بداو حەرام و حەڵاڵیان بۆ جودا بکاتەوە بە پێی حوکمی خواو شەرعەکەی لەگەڵ هێنانەدی بەڵگە (دلیل)ی صحیح لە قورئان و سوننەت یان بە پێوان (قیاس)ێکی تەواو یان کۆڕا (الاجماع)ی زانایان و هی تریش... وە ئەگەر ئەو موسڵمانە لە ڕەشۆک (عوام)ی خەڵکی بوو یان پسپۆڕو شارەزا نەبوو لە زانستە شەرعی‌یەکاندا ئەوە دەبێ هەوڵ بدات بۆ زانینی ئەو بەشانەی کە خۆی پێویستی‌یەتی لە ئەحکامی عیبادەتکاری‌یەکان یان مامەڵە (معاملات) کردن یان لایەنێکی دیکە...

ئنجا ئەمەش لە ڕێگەی توێژینەوەی پەڕاو -کتێب-ە ئاسان کراوەکان دەکرێ ئەگەر بۆی بڕەخسێ، یان بەهۆی بەدوا گەڕان و وەرگرتن لەو زانایانەی کە خوای گەورە دەربارەیان دەفەرموێت: ﴿فاسألوا أهل الذكر إن كنتم لا تعلمون﴾[٢٥٣]

واتە/ (لە زانایانی ئەهلی ئیمان بپرسن ئەگەر لە شتێکتان نەزانی).

---

النحل ٤٣

# وانەی دووەم:

## ﴿يا أيها المدثر، قم فأنذر، وربك فكبر، وثيابك فطهر، والرجز فاهجر ولا تمنن تستكثر، ولربك فاصبر﴾المدثر/١-٧

واتە/ (ئەی ئەو کەسەی کە خۆت داپۆشیوە، هەستە بترسێنە بەسزای خوا، تەنها پەروەردگار تایبەتمەند بکە بەگەورەو بڵندی، جل و بەرگت خاوێن بکە (کینایەتە بۆ خاوێنی دڵ و دەروون) لە پیسیو بت پەرستی وازبێنەو کۆچ بکە، چەند کار بکەیت و هەوڵ بدەی منەت مەکە، با خۆڕاگریو ئارام گرتنت تەنها بۆ پەروەردگارت بێت).

پێغەمبەری خواﷺ ئەم فەرمانانەی پێ گەیشت، سادەو ساکار لە دیاردەدا پڕ ماناو مەبەست لە ناوەڕۆکدا، کاریگەرو جولێنەر لە دەروون و واقعدا ئەمەش کورتەی ئەو فەرمانانەیە:

١- ﴿يا ايها المدثر﴾: سروش و نیگای خوایە بۆ پێشەوای مرۆڤایەتی دەنگێکی بەرزو بڵندە لە ئاسمانەوە کە پێغەمبەرﷺ لە خۆشیو گەرمی پێخەف و -نوێن- دەردەکاتە دەرەوە بۆ مەیدانی هەوڵ و تێکۆشان پاڵی پێوە دەنێت و دەیخاتە ناو کێشمەیەکی تاڵ و درێژ خایەن، ئاگاداری دەکاتەوەو پێی دەڵێت: ئەوەی بۆ خۆی دەژی خۆش حاڵ و ئاسوودەیە، دوور لە گیرو گرفت و ماندوو بوونە، بەڵام تۆ ئەرکێکی گەورەو گرانت پێ سپێردراوە، فەرمانێکی قورست بۆ ئامادە کراوە، کاتی خەوو پشوودان نەماوەو بەتاڵیو بێ کاری لە ژیاندا کۆچ دەکات هەستە کار بکەو تێ بکۆشە...

٢- ﴿قم فأنذر﴾: مەبەست لە ڕاگەیاندن و ترساندنی هەموو مرۆڤایەتییە لە بووندا، وە دیاری کردنی پاشەڕۆژی ڕەش و ترسناک بۆ ئەو کەسانەی کە پێچەوانەی ڕەزامەندی خوا دەجولێنەوە بە جۆرێک کە ڕایان بچڵەکێنێت و بێداریان بکاتەوە.

٣- ﴿وربك فكبر﴾: مەبەست لە بەگەورەکردنی پەروەردگارو لەبن هێنان و کۆتایی پێ هێنانی هەموو دەستەڵات دارو هێزێک کە خۆی بەخوای ئادامیزاد دەزانێت وە تێکشاندنی

هەموو شێوازی زۆرداریو مل هوڕییەکە، بە جۆرێک کە تەنها گەورەییو دەستەڵات داری خـوا بوونی هەبێت و تەنها ئەو تاکە پەرستراو بێت لە ڕووی زەویدا.

٤- ﴿وثيابك فطهر، والرجز فاهجر﴾: مەبەست لە خاوێنی جل و بەرگ و کۆچ کـردن لـە پیسی زیاتر گرنگـی دانـە بـە پـاکی نـاوەوەو دەرەوەی مـرۆڤ بـە شـێوەیەک کـە دەروون پـاک بکرێتەوە لە هەموو ناتەواوێو کەم و کورتییـەک. تـا دەگاتـە ڕادەی تـێربوون بـە جۆرێـک کـە دەرەوەو ناوەوەی مرۆڤ ببێتە دوو شێوازی هاوشێوە بۆ یەک کەس، بتوانێت دڵـە سـاغەکان بـۆ لای خۆی کێش بکات و دڵە نەخۆشەکان هەست بە گەورەییو بڵندی بکەن.

٦- ﴿ولا تمنن تستكثر﴾: مەبەست لەزۆر منەت نەکردن باس نەکردنی چاکەکانمانـەو زۆر گەورە نەکردنی ئیش و توانامانە بەڵکو پێویستە کار لـەدوای کـار بـەردەوام بـین، بەخشـین و هەوڵدانمان زیاتر بێت، بێ وچان بین و ماندوو نەبین، بەڵام بەجۆرێک کە هەست نەکەین چەند کارمان کردووەو چاوەڕێی پاداشت و چاکەی شـوێن کـەوتوانمان نـەبین، دڵ و چاومـان پـەیوەند بێت بە قیامەتەوەو دەست بەکارو خەبات بین.

٧- ﴿ولربك فاصبر﴾: لە کۆتاییدا خوای گەورە ئاگادارمان دەکاتەوە کـە هـەڵگرانی ئـەم بەرنامە تووشی چەندین چەرمەسـەریو گـیرو گـرفت دەبـن و جۆرەهـا بەربەسـت و ئـازار دێتـە ڕێیان، بەڵام پێویستە بە ئـارام و خۆگربـن، هەناسـە درێـژو لەسـەرخۆبن، بـەهێزو بـەردەوام بـن نەپسـێن لـەژێر هیـچ زەبـرو زەنـگ و هـێزو داواکارییـەکی دوژمنـدا، گـەر هـەموو شـوێن کەوتوانیشیان تێدا بچێت و خۆشیان ببنە قۆچی قوربانی نابێت هیچ لە بەرنامەکەیان بە بەرزتر بگرن.

بەڵێ... پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ماوەی بیست و سێ ساڵ هەسـتایە سـەر پـێ دەسـتی دایـە خەبات گێڕان و کارکردن، تامی پشـوو خۆشـی ژیـانی نەچەشـت، کـەم تەرخـەمیو بـەتاڵی لـە ژیانیدا بەدی نـەکرا، بـانگی خـوای گـەیاندە مرۆڤایـەتی بـە تـێرو تـەواوی، بەرامبـەر زۆردارو خراپەکاران دەستی دایە جیهاد، بەئارام و خۆگر بوو بەرامبەر ئەو چەرمەسەریو ناەحەتیانـەی کە تووشی بوون لە کاروانی جیهادو بانگەوازدا، توانی ئەرک و پێویستی سەرشانی بە جوانـترین شێوە ڕاپەڕێنێت، دڵسۆزیو بەزەیی خۆی بنوێنێ بە جۆرێک کە لەسەرەمەرگیشـدا هـەر هـاوار بکات: (يا رب أمتي أمتي). واتە: پەروەردگارە گەل و نەتەوەو ئوممەتەکەم.

# وانەی سێهەم:

## ﴿يا أيها الذين آمنوا اتقوا الله وابتغوا اليه الوسيلة وجاهدوا في سبيله لعلكم تفلحون﴾

**المائدة/٣٥**

واتە/ (ئەی ئەو کەسانەی کە ئیمانتان هێناوە لەخوا بترسن و ڕێگاکانی گەیشتن بە خوا بگرن و لە پێناوی خوادا جیهاد بکەن بەڵکو ڕزگاری بەدەست بهێنن...).

ئنجا با بزانین خوای گەورە چیمان لێ داوا دەکات و لە پاداشتیدا چیمان پێ دەبەخشێت:

یەکەم/ ڕووی فەرمانەکەی لە بڕوادارانە -چ پیاوو چ ئافرەت-.

دووەم/ سێ داواکاری تێدایە: (تەقوای خوا/ گرتنی ئەو ڕێگایانەی دەمان گەیەنێت بەخوا/ جیهادکردن لەپێناوی خوادا).

سێیەم/ پاداشت و ئەنجامی بەجێ هێنانی ئەم ئایەتە ڕزگارییە لە گومڕاییو لە شەیتان و لە ئاگری دۆزەخ.

یەکەم/ دیارە کەسانێک ئامادەن ئەرک و فەرمانی خوا جێ بەجێ بکەن کە بڕوایان بەوە هەبێت ئەو خالق و حاکمەو خاوەنی ناوو سیفاتی تەواوەو کەم و کوڕی تێدا نییەو مرۆڤیش بە هەموو شێوەیەک پێویستی بە ڕێنماییو سۆزو بەرەیی خوا هەیە زۆر هەژارە پێی، بۆیە بۆ هەموو فەرمانێکی خوایی پێویستە (لبیک اللهم لبیک) بکات لەپێناوی جێ بەجێ کردنیدا گوێ بە هیچی تر نەدات.

دووەم/ ئەو ئەرکانەی خوا لە بەندەکانی داوا دەکات:

* اتقوا الله: لەخوا بترسن... هەموو خوێنەرێکی قورئان دەزانێت کە خوای گەورە زۆر گرنگی بەم سیفەتە داوەو لە چەندەها ئایەتدا داوای کردووە یان ڕێگاکانی گەیشتن بەم سیفەتە دیاری دەکات یان پاداشت و عاقیبەتی تەقواکاران دەردەخات و پلەیان دیاری دەکات.

زانایانیش پێناسەی زۆریان بۆ تەقوا کردووە کە دیارترینیان بریتییە لەوەی لە هەموو

کاتێکدا وابزانی کە خوا دەبینی، یان بزانی خوا دەتبینیو چاودێرە بەسەرتەوەو تۆش بەوە ڕازی بکەی کە فەرمانەکانی جێ بەجێ بکەیو واز لە حەرامەکان بهێنی. بۆ ئەوەی ئەم حاڵەتە لە ئیمانداراندا دروست بێت دەبێت هەوڵی بەدەست هێنانی زانیاری تەواو بدەنو دەربارەی زات و سیفاتی خواو دەربارەی حەڵاڵ و حەرام، خوای گەورەش خۆی گرنگی زانیاری بۆ ترسان لەخوا دیاری دەکات و ترسان لەخوا تایبەت دەکات بە زانایانەوە ﴿انما یخشی الله من عبادە العلماء﴾[٢٥٤]

شوێنی (تەقوا)ش دڵەو ئەم سیفەتە لەدڵدا هەمیشە وەک چاودێرێک بەسەر ئەندامەکانەوە وەستاوەو هەڵس و کەوتیان بۆ دیاری دەکات و فەرمان بە چاکە دەکات و بەرگری لە خراپە دەکات. پێغەمبەری خواش ﷺ ئەوەی دیاری کردووە کە چاکی کردەوەکان بەستراوە بە چاکی دڵەوە وەک دەفەرموێت: (... الا وان في الجسد مضغة اذا صلحت صلح الجسد کلە واذا فسدت فسد الجسد کلە، الا وهي القلب) بەشێکە لەو فەرموودەی بوخاریو موسلیم ڕیوایەتیان کردووە لە ئەبو عبدالله نوعمانی کوڕی بەشیر...

دیارە هەر ئیماندارێک خاوەنی ئەم سیفەتە بێت ئەوا ئاشکراو نهێنی لە تەنهاییو ناوکۆمەڵی وەک یەک وایەو دڵی هەمیشە بەئاگاو زیرەکەو خۆی لە توڕەییو ناڕەزایی خوا دوور دەخاتەوە، بۆیە بەهرەداران بەتەقواوە بەڕێزترین کەسن لای خوای گەورە: ﴿ان اکرمکم عند الله اتقاکم﴾[٢٥٥]

هەروەها لە دنیادا دەرگای ڕزقی لێ دەکرێتەوەو کاروباری بۆ ئاسان دەکرێت ﴿ومن یتق الله یجعل لە مخرجاً ویرزقە من حیث لا یحتسب﴾[٢٥٦] ﴿ومن یتق الله یجعل لە من امرە یسراً﴾[٢٥٧] لە قیامەتیشدا لێ خۆشبوون و پاداشتی ئەبڕاوە ﴿ان تتقوا الله یجعل لکم فرقاناً ویکفر عنکم سیآتکم ویغفر لکم﴾[٢٥٨]

---

طر ٢٨

حجرت ١٣

طلاق ٢-٣

طلاق ٤

نفال ٢٩

﴿ان المتقين في جنات وعيون آخذين ما آتاهم ربهم أنهم كانوا قبل ذلك محسنين﴾[٢٥٩]

خوایە ئێمەش ئیمانمان بەتۆ هێناوەو دوعاکەی پێغەمبەریش ﷺ دووبارە دەڵێینەوە تۆش ئەم سیفەتە لە دڵماندا دروست بکە (اللهم آت نفوسنا تقواها وزكها أنت خير من زكاها أنت وليها ومولاها).

* وابتغوا اليه الوسيلة: (وسیلە) چەند واتایەکی هەیە: ابن عباس دەڵێ: داوای نزیک بوونەوەیە لەخوا.

قتادەش دەڵێت: بریتییە لە نزیک بوونەوە لەخوا بەهۆی گوێ ڕایەڵی کردن لە فەرمانەکانی (وسیلە) هۆیە بۆ گەیشتن بە مەبەستێکی دیاری کراو (وسیلە) ئالایەکە دانراوە لە بەرزترین شوێنی بەهەشتدا کە شوێنی پێغەمبەرمانە ﷺ و نزیکترین شوێنی بەهەشتە لە عەرشی خواوە لە صحيحی مسلم دا هاتووە (اذا سمعتم المؤذن فقولوا مثل ما يقول، ثم صلوا علي فانه من صلى عليّ صلاة صلى الله عليه عشراً، ثم سلوا لي الوسيلة، فانها منزلة في الجنة لا تبتغي الا لعبد من عباد الله وأرجو ان أكون أنا هو، فمن سأل لي الوسيلة حلّت عليه الشفاعة).

ئەگەر (وەسیلە) لێرەدا بە واتای گرتنی ڕێگاکانی نزیک بوونەوە بێت لەخوا ئەوا هەر ئەو ڕێگایانەیان کە خوا خۆی دایناون بەڕاست و دروستی زانیون، چونکە مرۆڤ زۆر جار لە ڕێگە لا دەدات و واش دەزانێت لەسەر ڕێگەی ڕاستە.

## ئەو ڕێگایانەی خوا دایناون بۆ گەیشتن بەخۆی:

١- باشترین قسەو کردەوەی چاک وەک دەفەرموێت: ﴿اليه يصعد الكلم الطيب والعمل الصالح يرفعه﴾[٢٦٠] ﴿وأدخلناه في رحمتنا انه من الصالحين﴾[٢٦١]

لە قسە چاکەکانیش بانگ کردنە بۆ لای خوا ﴿ومن أحسن قولاً ممن دعا الى الله وعمل

---

الذاريات ١٦

فاطر ١٠

الأنبياء ٧٥

صالحاً﴾[٢٦٢] یان هەڵبژاردنی قسە بۆ بەرانبەرەکەت تا دڵی گران نەبێت و شەیتان نەتوانێت نێوانیان تێک بدات، ﴿وقل لعبادي يقولوا التي هي حسن ان الشيطان ينزغ بينهم﴾[٢٦٣]

٢- دوعاو پاڕانەوە لەخوا وەک دەفەرموێت: ﴿أولئك الذين يدعون يبتغون الى ربهم الوسيلة﴾[٢٦٤] گرتنی ڕێگای پاڕانەوەش بۆ نزیک بوونەوە لە خوایان بەناوە پیرۆزەکانی خوا دەبێت وەک دەفەرموێت: ﴿و لله الاسماء الحسنى فادعوه بها﴾[٢٦٥]

پێغەمبەری خواش ﷺ چۆنێتی کردنی دوعاکانی بۆ دیاری کردووین یان ئەگەر کەسێک بە گەورەترین ناوی پاڕابێتەوە هانی داوە کە خەڵکی تریش چاوی لێ بکەن وەک فەرموویەتی: ﴿لقد سأل هذا باسم ا لله الأعظم الذي ما سئل به الاّ أعطي وما دعي به الا أجاب﴾[٢٦٦]

٣- کڕنۆش و سوجدە بردن: وەک لە فەرموودەیەکدا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (أقرب ما يكون العبد من ربه وهو ساجد)[٢٦٧]

ئەو ڕێگەیەی مرۆڤ زۆر زوو پێی نزیک دەبێتەوە لەخوا زۆری سوجدە بردنە.. خوای گەورەش دەفەرموێ: ﴿واسجد واقترب﴾[٢٦٨]

واتە/ سوجدە ببەو نزیک بەوە لەخوا.

٤- فەرزەکان و سوننەتەکان: پێغەمبەر ﷺ لە حەدیسێکی قودسیدا دەفەرموێت: (وما تقرب اليّ عبدي بشيء أحب اليّ مما افترضته عليه، ولا يزال عبدي يتقرب اليّ بالنوافل حتى أحبه.. )[٢٦٩]

کەواتە گرتنی ڕێگەی نزیک بوونەوە بەو ڕێگەیە ی کە خوای گەورە خۆی زۆر ئەو ڕێگەیەی خۆش دەوێت ڕێگەی جێ بەجێ کردنی فەرزەکانەو ڕێگەیەکی تریش هەیە ئەگەر مرۆڤ تێیدا

---

فصلت/٣٣

الاسراء/٥٣

الاسراء/٥٧

الاعراف/١٨٠

منهاج المسلم ص٥٥

رواه مسلم وغيره

العلق/١٩

متفق عليه

بەردەوام بێت دەگاتە بەخوا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەبێتە خۆشەویستی خوا، ئەویش ڕێگەی بەجێ هێنانی سوننەتەکانە (ولا يزال عبدي يتقرب اليّ بالنوافل حتى أحبه).

هەر بۆیەش خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿قل ان كنتم تحبون الله فاتبعوني يحببكم الله...﴾[270]

خوایە داواکارین لێت یارمەتیمان بدەی بۆ گرتنی هەموو ئەو ڕێگایانەو ڕێگامان لێ ون نەبێت، سوپاس بۆ ئەو خوایەی ڕێگای گەیشتن بەخۆی بۆ دیارو ئاسان کردووین دیارە هەر ڕێگەیەکیش جگە لەم ڕێگانە ڕێگای شەیتانەو بۆ گومڕاییو سەرلێ شێواندن و چەواشە کردنە.

* وجاهدوا في سبيله: جیهادو تێکۆشان لە پێناوی خوادا چڵەپۆپەی ئیسلامەو تێکۆشەرانی ڕێگەی خواش بەرزترین شوێنی بەهەشتیان پێ دەدرێت و لەو دنیاشدا سەر بەرزیو گەورەییان دەست دەکەوێت، پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەروو هەموو تێکۆشەرانی ڕێگای خواوەیەو هەموو جۆرو پلەکانی جیهادی بڕیوە بە جوانترین و بەرزترین شێوە بەدڵ و بەزمان، بە بانگ کردن، بە ڕوون کردنەوەی ڕێگای خراپە، هێزو شمشێر، هەموو ژیانی تێکۆشان بوو بێ سرەوتن، بۆیە لەناو هەموو مرۆڤایەتی ناوو یادی بەرزترەو لای خوا لە هەموویان بەرێزترە.

کاتێک خوا فەرمانی کرد بە پێغەمبەر ﷺ بە جیهاد: ﴿ولو شئنا لبعثنا في كل قرية نذيراً، فلا تطع الكافرين وجاهدهم به جهاداً كبيراً﴾[271]

ئەم ئایەتە مەککییەو فەرمانی پێ دەکات بە جیهاد کردنی کافران بە هێنانەوەی بەڵگەو ڕوون کردنەوەی دین و گەیاندنی قورئان پاشان فەرمانی پێ کرد جیهادی مونافیقەکانیش بکات کە قورسترە لە جیهادی کافران ﴿يا أيها النبي جاهد الكفار والمنافقين واغلظ عليهم ومأواهم جهنم وبئس المصير﴾[272]

باشترین شێوەی جیهادیش وتنی قسەی حەقە لە کاتێکدا دژانی هەق هێزیان هەبێت، پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەموو کەس زیاتر ئەم شێوە جیهادەی کردووە، جگە لەم جۆرە جیهادە دەرەکییانە جیهادکردنی نەفس هەیە دەبێت پێش جیهادەکانی تر بکەوێت، چونکە ئەگەر

---

[270] آل عمران/٣١

[271] الفرقان/٥١-٥٢

[272] التوبة/٧٣

کەسێک نەیتوانی نەفسی خۆی ڕابهێنێت و ژێرباری بخات بۆ جێ بەجێ کردنی فەرمانەکان و وازهێنان لە حەرامەکان چۆن دەتوانێت جیهاد لەگەڵ دەرەوەی خۆیدا بکات؟!!

جیهادکردن لەگەڵ ناوەوەو دەرەوەدا خوا داوای دەکات لە هەموو مرۆڤێک و مرۆڤی تاقی کردۆتەوە بە دوژمنێک کە هەتا بەسەر ئەو دوژمنەدا سەر نەکەوێت ناتوانێت بەدوو جیهادەکەی تر هەستێت، ئەویش جیهاد کردنی شەیتانە کە وەستاوەو هەمیشە هەوڵی ئەوە دەدات بەندەکانی خوا سارد کاتەوە لە جیهاد (ترس و تەمبەڵیو هیوا بەژیان.... هتد. دەخاتە ناو دڵیانەوە). خوای گەورەش بۆ سەرخستنی بەندەکانی یارمەتیو چەکی شەڕ دەنێرێت و بەندەکان دڵنیا دەکات لەوەی خۆی پشتیان دەگرێت، فریشتەکانیش دەنێرێت بۆ یارمەتی دانیان و ئەگەر ئەوان ڕاست بکەن و تەنها مەبەستیان جیهاد کردن بێت و جێ بەجێ کردنی فەرمانەکانی خوا بێت.

کەواتە جیهادکردن چوار پلەیە:

[جیهادی نەفس، جیهادی شەیتان، جیهادی بێ باوەڕان و موشریکان، جیهادی مونافیق و دەغەڵەکان].

جیهادی نەفسیش هەر چوار پلەیە:

یەکەم/ ماندووی بکات لەپێناوی فێربوونی دیندا، ئەو دینەی کە خۆشیو رزگاری دنیاو قیامەتی پێوە بەندە.

دووەم/ نەفسی ڕابهێنێت بۆ کارکردن بەوانەی فێری بووە، چونکە تەنها زانیاری بە تەنیا ئەگەر کاری پێ نەکرێ سوودی نییە.

سێیەم/ خەڵکی تریش بانگ بکات و فێریان بکات، چونکە ئەگەر وا نەکات لە ڕیزی ئەوانەیە دین و ئایەتەکانی خوا دەشارنەوەو نایگەیەنن و کردەوەکانی سوودی پێ ناگەیەنن و زانیارییەکەیشی رزگاری ناکات.

چوارەم/ نەفس ئارام بکاتەوە کاتێک تووشی ماندوو بوون و سزا دەبێت لەپێناوی گەیاندنی دینەکەدا، ئەگەر هەر بەندەیەک ئەمانەی جێ بەجێ کرد پێ دەگوترێت مرۆڤێکی خوایی (ربانی)یە.

جیهادی شەیتانیش دوو پلەیە:

یەکەم/ بەرپەرچ دانەوەی هەر گومان و لەکەیەک کە شەیتان دەیەوێت لە ئیمانی مرۆڤدا دروستی بکات کە بەم پلەیە بەندەی خوا یەقین پەیدا دەکات.

دووەم/ بەرپەرچ دانەوەی حەزو ئارەزووەکان کە بەم پلەیەش بەندە فێری ئارام گرتن دەبێت، خواش دەفەرموێت:

﴿وجعلنا منهم أئمة يهدون بأمرنا لما صبروا وكانوا بآياتنا يوقنون﴾[٢٧٣]

جیهادی بێ باوەڕان و مونافیقانیش چوار پلەیە:

(بەدڵ، زمان، ماڵ و سامان، نەفس).

بۆ هەموو شێوەکانی جیهادیش باشترین نموونەی زیندوومان لە پێغەمبەری خوادا ﷺ دەست دەکەوێت:

﴿لقد كان لكم في رسول الله أسوة حسنة لمن كان يرجو الله واليوم الآخر وذكر الله كثيراً﴾[٢٧٤]

خوایە زۆر هەژارین و لاوازین لە هێزی خۆت بەشمان بدە تا سەردەکەوین بەسەر ئەو دوژمنانەداو بەسەر بەرزی بێینە حوزورت لە قیامەتدا...

ئەمانە ئەو سێ چەمکە بوون کە خوا رزگاری بەندەکانی پێوە بەستووە لە دنیاو قیامەتداو ئازایەتیش بۆ کەسێکە پێش لەدەست چوونی فرسەت خۆی رزگار دەکات و ناوی لەناو رزگار بوواندا تۆمار دەکات..

داواکارم لەخوای بەبەزەیی‌و بەخشندە ئەو رێگای رزگاریەمان بۆ ئاسان بکات...

---

٢٧٣ السجدة/ ٢٤

الاحزاب ٢١

# وانەی چوارەم:

## ﴿يا أيها الذين آمنوا استجيبوا لله وللرسول اذا دعـاكم لما يحييكم واعلموا ان الله يحول بين المرء وقلبه وأنـه اليـه تحشرون﴾[275]

واتە/ ئەی ئەو کەسانەی ئیمانتان هێناوە! وەڵامی خواو پێغەمبـەری خـوا بدەنـەوەکاتێک پێغەمبەرﷺ بانگتان دەکات بۆ ئەو شتانەی کە ژیانتـان بـۆ دروست دەکـات، ئـەوەش بزانـن خوای گەورە ئاگای لە دڵتانە (ڕاست دەکەن یان نا) بۆ لای خوای گەورەش کۆ دەکرێنـەوە بـۆ لێ پێچانەوەو موحاسەبە.

ڕاڤەی یەک دوو وشە:

١- ئیمان: بریتی‌یە لە قبووڵ کردنی خواو پێغەمبـەری خـواﷺو ڕازی بـوون و جێ بـەجێ کردنی بڕیارەکانیان واتە ئیمان بریتی‌یـە لـە: (**النطق باللسـان والعمـل بالأركـان والتصديق بالجنان**) چونکە ئیمان پێک دێت لە هەرسێک جەمسـەرە سـەرەکیەکان کـە بریتـین لـە وتنـی (قول) بەزوبان و کردن (فعل) بە ئەندامەکان و بڕوا بوون (اعتقاد) بەدڵ.

٢- لما يحييكم: ئەوەی ژیان (**حياة**)ی تێدایە بۆتان... ژیان بۆ (فکر)و (عقل)تان ژیان بـۆ دڵ و سۆزتان، ژیان بۆ خێزان و منداڵتـان... ژیـان بـۆ گـەل و میللـەتتان، ژیـان بـۆ ئاخیـرەت و دواڕۆژتان: ﴿**وان الدار الآخرة لهي الحيوان لو كانوا يعلمون**﴾[276]

واتە/ ژیانی ئاخیرەت و دواڕۆژ ژیانە... ئەگەر ئێوە بزانن.

٣- **يحول بين المرء وقلبه**: ئاماژەیە بۆ ئەوەی کەس ناتوانێ شت لەخوا بشارێتەوە، دەکـرێ ئیقرار بکات و توخمێکی خیانەتکاریش بێت لـەڕیزی موسـڵماناناداو موسـڵمانان پـێی نـەزانن بەڵام خوا پێی دەزانێت و دەزانێت (**اعتقاد وتصديق**) لەدڵیدا نی‌یە.

---

[275] الانفال/٢٤

[276] العنكبوت ٦٤

٤- اليه تحشرون: چاكە و خراپ... پاك و پیس (نیەت پاك و نیەت پیس) هەمووی زیندوو دەكرێنەوەو كۆدەكرێنەوە لەلای خوای گەورەش ڕیز لەڕاست گۆو دەست و دڵ پاك دەگرێت و خیانەتكارانیش ڕیسوا دەكات... ﴿الحق من ربك فلا تكونن من الممترين﴾[٢٧٧]

واتە/ هەق ئەوەیە خوا بیفەرموێت... لەگوماندا مەژی!

بەڵام غەیری ئەم دووانە (قورئان كە قسەی خوایە -سوننەت- كە قسەو كارو بڕیاری پێغەمبەرە ﷺ، تەفسیرو ڕاڤەی ئیسلامن و هەڵدەگرێ موناقەشە بكرێت و كامیان زیاتر لەگیانی شەریعەتەوە نزیكە كاری پێ بكرێت..

چوون بەدەنگ خواو پێغەمبەرەوە چوون ﷺ ژیان دروست دەكات و بە پێچەوانەوە پشت هەڵكردن لەخواو پێغەمبەری خوا ﷺ مرۆڤ بێ حورمەت دەكات و ژیانی تاڵ دەكات: ﴿ومن أعرض عن ذكري فان له معيشة ضنكاً ونحشره يوم القيامة أعمى...﴾[٢٧٨]

## ژیان یانی چی؟

ژیان واتە (سەلامەتی، حورمەت، سەربەرزی)... ئیسلام یانی سەلامەتیو دوور لە لەكەو نەخۆشی لەهەر بوارێكدا بێت...

١- پاراستنی (عقل) لە هەموو جۆرە شتێكی بێ بەرهەم و خورافەیەك.

٢- پاراستنی (دین) لە هەموو جۆرە گومان (**شبهة**)و ئارەزوو (**شهوة**)یێك.

٣- پاراستنی سەروەت و سامان و ماڵ (مال) لە حەرام خۆریو تێدا چوون.

٤- پاراستنی وەچە (نسل) لە هەموو زایە بوونێك...

٥-پاراستنی گیان و دەروون (النفس) لە كوشتن و بڕین و تاوانكاری.

لەگەڵ ئەوانەدا ئیسلام بە (حورمەت)ت دەكات لە دنیاداو لە قیامەتیشدا لای خواو لای مەلائیكەی خواو خەڵكی خوا.

دوای ئەمەش ئیسلام سەربەرزیو عیززەت لە مرۆڤدا دروست دەكات و تەنیا مل كەچی بۆ

---

[٢٧٧] البقرة/١٤٧

طه/١٢٤

یەکێ خوای پێ دەکات..

﴿ضرب ا الله مثلاً رجلاً فيه شركاء متشاكسون ورجلاً سلماً لرجل هل يستويان مثلاً الحمد لله بل أكثرهم لا يعلمون﴾[279]

واتە/ خوای گەورەیە نموونەیەکتان بۆ دێنێتەوە، دوو پیاو هەن...

-یەکێکیان خۆی داوەتە دەست چەند کەسێک کە هەریەکەی داوایەکی لێ دەکات و ئەوی دیکەش خۆی داوەتە دەستی تەنیا یەک کەس... ئایا حاڵی دەروونیو عەمەلی ئەو دوو پیاوە یەکسانن.. (الحمد لله) لەلام خۆ زۆر کەس ئەمە نازانێت.

[279] الزمر/٢٩

# وانەی پێنجەم:

## ﴿والذين يؤتون ما آتوا وقلوبهم وجلة أنهم الى ربهم راجعون﴾المؤمنون/٦٠

ابن كثير -رەحمەتی خوای لێ بێت- لە تەفسیری ئەم ئایەتە پیرۆزەدا دەڵێ: (ئـەم ئایەتـە پیرۆزە دەربارەی ئەو ئیمانداره لەخوا ترسانەیە کە کاتێک شتێک دەبەخشن لەوە دەترسێن کـە لێیان قبووڵ نەکرێ، چونکە خـەمی ئەوەیانـە کـە کـەم و کورِیـان هـەبێت لـە بـەجێ هێنـانی مەرجەکانی بەخشین، ئەم ترسەش لەبابی پارێزگاریو میهرەبانی‌یەوەیە.

واتە/ ترسەکە لەوەیە کە کردەوەی براوادار بەسـەریدا رِەت بکرێتـەوەو خـوای گـەورە لێـی قبوڵ نەکات جا چۆن ئیماندار ـەترسی لە کاتێکدا کە بێ ئاگایە لە ئەنجامی کردەوەکانی؟!

ئاشکرایە زانینـی ئـەم ئەنجـامـەش شـتێکی نادیـارو غـەیبی‌یـەو لـەخوای گـەورە بـــترازێ کەسیکی تر زانیـاریو علمی دەربارەی نی‌یە، خـاتوو عائشـە -خـوا لێـی رازی بـێ- دەڵـێ: لـە پێغەمبەرﷺ پرسی: ئایا ئایەتی ﴿**والذين يؤتون ما آتـوا وقلوبهـم وجلـة**﴾ دەربـارەی ئـەو کەسانەیە کە مەی دەخۆنەوەو دزی دەکـەن؟ پێغەمبـەرﷺ فـەرمووی: (**لا يـا بنـت الصديـق، ولكنهم الذين يصومون ويصلون ويتصدقون وهم يخافون ان لا يقبل منهم أولئك يسـارعون في الخيرات**)[280]

واتـە/ (نـەخێر ئەمـە لـەبارەی ئـەو کەسـانەیە کـە رۆژوو دەگـرن و نوێـژ دەکـەن و خـێرو سەدەقەش دەکەن، بەڵام ترسـی ئـەوەیان هەیـە کـە لێیـن قبـوڵ ـەکرێ، ئەمانـەن کـە دەسـت پێشخەری لەخێرو چاکەکاریدا دەکەن و زوو بەجێیان دەگەیەنن).

کەواتە پێویستە لەسەر موسڵمانان کە تەنها لەخوای گـەورەو پـەروەردگار بترسـێن و جگـە لەو ترسیان لەهیچ کەس و لەهیچ شتێکی تر نـەبێت، دیـارە شـوێنگەو جێگـەی ترسـیش دڵـە، بەڵام کاریگەری بەسەر ئەندامانـدا رِەنگ دەداتەوە کە بەهۆی ترسـی خـواوە لـە گونـاهو تـاوان

[280] [illegible]

دەگەڕێنەوەو دەست بە فەرمانبەرداری خواوە دەگرێت و هەموو باوەڕدارێکیش بەوە وەزعی چاکە کە ترسی لە دڵدا هەبێت، بەڵام بەنەمانی ئەو ترسە تووشی گومڕاییو سەرلێ شێواوی دەبێت.

ترسیش لە چەند شتێکدا ڕەنگ دەداتەوە ە گرنگترینیان ئەمانەن:

یەکەم/ ئەو شتانەی کە پەیوەندییان بە ئاین و بە ڕۆژی دواییەوە هەیە:

أ-ترسان لە نەمانی دڵسۆزی (**اخلاص**) بۆ خواو لە تێکەڵ بوونی لەگەڵ دڵسۆزی بۆ غەیری خوای گەورە.

ب- ترسان لە تووش بووی فیتنە لە دیندا، بۆیەش پێغەمبەرﷺ زۆر جاران لە دوعا کردنیدا دەیفەرموو: (**یا مقلب القلوب ثبت قلبي علی دینك**)[281]

واتە/ (ئەی ئەو خوایەی دڵان هەڵگێڕو وەرگێڕ دەکەی دڵم لەسەر دینەکەی خۆت جێگیر بکە).

خوای گەورەش دەفەرموێ: ﴿**واعلموا ان الله یحول بین المرء وقلبه**﴾[282]

واتە/ بزانن کە خوای گەورە مرۆڤ لە دڵەکەی جودا دەکاتەوەو دەکەوێتە نێوان مرۆیەکەو ئەو شتانەی کە دڵی خۆزگەیان بۆ دەخوازێ، لە تەمەن درێژیو هیوایەت زۆری بەوەی کە لە کتوپڕیدا دەیمرێنێو وای لێ دەکات کە تواناو دەسەڵاتی بەسەر دڵیدا نەشکێت بۆیە پێویستە لەسەرتان کارو کردەوەی چاکە دوا نەخەن چونکە مردن چارەسەرتان دەکات!!

دووەم/ ترسان لەو بەڵاو ناڕەحەتیانەی کە لە دنیادا تووشی مرۆڤ دەبن وەک هەژارییو نەخۆشیو مردنی منداڵ و لەدەست دانی هەر نیعمەتێکی تر، ترسیش لێرەدا لە تووش بوونی ئەم جۆرە بەڵایانە نییە بەڵکو ترس لە فیتنەکانی دینە کە ڕەنگە بەدوای ئەم بەڵاو ناڕەحەتیانەدا بێت، کەواتە ترسەکە تاقی کردنەوەی مرۆڤ دەگرێتەوە لەو بەڵاو تاقیکردنەوانە لەگەڵ ئەو کەم و کوڕیانەی کە لە ئیمان و دینی مرۆڤدا ڕوو دەدەن لەدوای ئەم بەسەرهاتانە بۆیەش پێغەمبەرﷺ لە نزاکانیدا دەیفەرموو: (**ولا تجعل مصیبتنا في دیننا**)[283]

---

[281] اخرجه الأجري والحاكم وابن ماجه وصححه الالباني.

[282] الانفال/ ٢٤

[283] قطعة من حديث خرجه الترمذي وغيره وحسنه الالباني

واته/ خوایه بەڵاو فیتنەکانمان مەخەرە دینەکەمان.

جا کەسێک بیەوێ ترسی خوای گەورە وەدەست بێنێ پێویستە تێبینی ئەم خاڵانە بکات:

١- زەروورەتی زانین و یادکردنەوەی سیفەتەکانی خوایە لە پایەبەرزیو دەستەڵاتداریو باڵادەستیو مەزنێتیو گەورەیی کە دەبێتە هۆی پڕ بوونی دڵ و دەروون لە ترسان لە خوای گەورە کە ئەمەش دەبێتە هۆی وەدەست هێنانی ڕەزامەندی خواو دوورکەوتنەوە لە خەشم و قینی خوا، چونکە مرۆڤ تا زیاتر خوای گەورە بناسێت زیاتر لێی دەترسێت ﴿إنما يخشى الله من عباده العلماء﴾.

٢- زەرورەتی زانین و یادکردنەوەی سیفەتە خودی (زاتی)یەکانی دروست کراوەکان لە لاوازیو بێ دەسەلاتیو نەزانیو نەشارەزایی بە ڕێکخستنی کاروباری ژیان و بێ ئاگایی لە شتە نادیارو غەیبی‌یەکان و هەژاریو پێداویستی.

٣- بەئاگاییو شارەزابوون لە ناخۆشیەکان و چەندێتیو هۆکارەکانی، بۆ نموونە: ئەگەر هەر بەندەیەک ئەندازەی سزای گۆر بزانێ لێی دەترسێت ئەگەر نا لێی ناترسێ چونکە هەر کەسێک نەزان بێت لە ئاستی شتێکدا لەم شتە ناترسێ هەروەکو منداڵێکی بچووک کە باکی نییە لەیاری کردن بە کارەباو ئاگر چونکەئەندازەی زەرەرو زیانەکەیان نازانێ.

٤- کەیف بەخۆ هاتن (العجب بالنفس)و کەیف هاتن بە کردەوەکان ئەمەش دەردێکی زۆر کوشندەیەو واز لە بەندە ناهێنێ تا بەتەواوی ترسی خوای لەدڵ دەباتە دەرو ئەو کاتە وا دەزانێ کە پلەو پایەیەکی بەرزی هەیە لای خواو بە ئاسوودەییو بێ خەمی لێی پاڵ دەداتەوەو پشتێنی لێ دەکاتەوەو ترسی لە دڵدا نامێنێ.

٥- گرنگی نەدانی بەندە بە مافەکانی خواو ئەرکەکانی خۆی لە بەرامبەر خوای باڵادەست و هەستان بە گوناهو تاوان ترسی خوای لە دڵدا ناهێڵێ، چونکە پەیوەندی نێوان ترس و گوناهکاری پێچەوانەن بەکەم بوونەوەی گوناه ترس زیاد دەکات و بەزیاد بوونی گوناه ڕێژەی ترس کەم دەبێتەوەو لە دڵدا نامێنێ.

جۆرەکانی ترس:

١- ئەگەر ترس ترسی پەرستن بێو ترساو بەهۆیەوە لەلێ ترساو نزیک بێتەوە ئەم جۆرە ترسە یەکێکە لە جۆرەکانی عیبادەت و نابێ جگە لە خوای گەورە بەرامبەر کەسێکی تر

هەبێت چونکە دەبێتە هاوبەش بڕیاردانی گەورە (الشرك الاكبر).

٢- ئەگەر ترسەکە سورشتی (**فطري**) بوو وەك ئەوەی لە دوژمنێك بترسێ یان لە گیان لەبەرێك یا لە ژانێك... هتد ئەم جۆرە ترسە لە عیبادەت نییەو لەوانەیە تووشی زۆر لە ئیماندارانیش بێت و بەهاوبەش بڕیاردان (شرك) ناژمێردرێت.

* تكا -الرجاء- بریتییە لە چاوەڕێ کردنی شتێکی وەها کە لای دەروون (نفس) خۆشەویست بێو وەدەست هێنانێ ئەم شتەش پێویستی بە هەندێ هۆکار بێت لە سنووری تواناو دەست ڕۆیشتن، بۆیە هەر شتێکی چاوەڕوان کراو دەبێ هۆکارێکی هەبێ ئەگەر ئەم هۆکارەش وەدی نەهات نابێتە تکا -الرجاء- بەڵکو دەبێتە هیواخوازی (**التمني**) جیاوازی نێوان هیواخوازیو تکا زۆر فراوانە چونکە تکا بۆ کەسێکە کردەوەی هەبێت بەڵام هیواخوازی ئی کەسێکە کردەوەی نەبێت ئەم کەسەش تکای بۆ نییەو ناشبێت چاوەڕێی هیچ بێت دەبینین فێرخوازێك (قوتابی)ێك بە درێژایی ساڵ تێ دەکۆشێو خۆی ماندوو دەکات چاوەڕوانیو تکای سەرکەوتن و دەرچوونی هەیە بە پێچەوانەی یەکێك کە نەی خوێندبێو هەوڵی نەدابێ کە تکای دەرچوون و چاوەڕوان کردنی لە لا نییە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿**فمن كان يرجو لقاء ربه فليعمل عملا صالحاً ولا يشرك بعبادة ربه احداً**﴾[٢٨٤]

واتە/ (جا ئەو کەسەی کە تکای گەیشتنی هەیە بە پەروەردگاری خۆی با کردەوەی چاك بکات و لە پەرستنی پەروەردگاریدا کەس نەکاتە هاوبەش و شەریکی، گرنگترین ئەو شتانەی کە پەیوەندییان بە تکاوە هەیە بریتین لە عیبادەت و گوناهو بەڵاو موسیبەتەکان جا ئەگەر بەندە تاعەتێکی بەجێ هێنا تکای قبوڵ بوونی دەبێ ئەگەر گوناهێکی کرد تکای لێ خۆش بوونی دەبێو ئەگەر تووشی بەڵایەکیش هات تکای لاچوونی دەبێت.

## هاوسەنگی ترس و تکاو تەواوکردنیان بۆ یەکتری:

ترس و تکا دوو ڕەگەزی تەواوکەری یەکترن بۆیە پێویستە لە دەروونی بڕواداردا هاوسەنگیین هەبێت چونکە هەر یەکێکیان لە ئەندازە دەرچێ کێشەکان هەڵدەگەڕێنەوەو کارەکە لەق دەبێو بەم شێوەیە ترس و تکا نابنە هاندەر بۆ ئەنجام دانی کارو کردەوە چونکە

---

ترس بەبێ تکا دەبێتە هۆی هیوابڕان و بێ ئاواتی خاوەنەکەیو تکاش بەبێ ترس خاوەنەکەی تووشی لەخۆ بایی بوون دەکات، هەندێ باری واش هەیە کە بڕواداری پێدا تێپەڕ دەبێ تەنیا دەگونجێ ترسی تێدا بیو هەندێ باری تریش هەن هەر تکای بۆ دەگونجێ چونکە بڕوادار:

أ- کاتێ دەڕوانێتە تاوانەکانی خۆی ترسی لا دروست دەبێ لە سزای خوای گەورە.

ب- ئەگەر سەیری ڕەحمەت و بەخشندەیی خوای میهرەبان بکات تکای لەلا دروست دەبێت.

ج- ئەگەر تاعەت و ئەرکێکی بەجێ گەیاند تکای قبوڵ بوون لەخوا دەکات و ترسی ڕەت کردنەوەی دەبێت.

د- ئەگەر تاوانێکی کرد تکا لەخوای گەورە دەکات کە تۆبەو پەشیمانی لێ قبوڵ بکات.

هـ- ئەگەر نیعمەتێکی بۆ هات تکای بەردەوامیو زیاد بوونی نیعمەتەکەو توانای سوپاس گوزاری دەکات و ترسی لەدەست چوونی ئەم نیعمەتەی دەبێ.

و- کاتێک تووشی بەڵایەک دەبێت تکای لابردنی لەخوای گەورە دەکات لەگەڵ تکای پاداشت وەرگرتن لەسەر ئارام گرتنی لەسەر ئەم بەڵایەو ترسی نەمانی پاداشتیشی دەبێت ئەگەر وەکو پێویست ئارامی نەگرتبێت و دانی بەخۆدا نەگرتبێ.

ز- هەرچی گوناهکارو تاوانکاریشە کە هەر چاوی لەهیواخوازی (تمني)یە ئەوە تکای بۆ دروست نییەو هەر ترسی بۆ دەگونجێ.

## لەنێوان ترس و تکا:

(عومەری کوڕی خەطاب) ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: ئەگەر دەنگێک لە ئاسمانەوە بانگی کرد: ئەی خەڵکینە ئێوە هەمووتان تێکڕا دەچنە بەهەشتێ تەنیا کەسێک نەبێت دەترسم ئەو کەسە من بم!!

وە ئەگەر دەنگێک بانگی کرد: ئەی خەڵکینە، ئێوە هەمووتان دەچنە دۆزەخەوە تەنیا کەسێک نەبێ تکا دەکەم ئەو کەسە من بم

# وانەی شەشەم:

## ﴿قل هذه سبيلي أدعوا الى الله على بصيرة أنا ومن اتبعني وسبحان الله وما أنا من المشركين﴾[285]

(ابن جرير الطبري) لە تەفسیری ئەم ئایەتە پیرۆزەدا دەڵێ: خوای پەروەردگار دەفەرموێت بە پێغەمبەرەکەی ((محمد))ﷺ ﴿قلْ﴾ بڵـێ ﴿هـذه﴾ ئـەو بانگەوازەیـەی مـن بـانگی بـۆ دەکەم، کە بریتی‌یە لە بانگکردن بۆ یەکتاپەرستی (تەوحید)و یەکلابوونەوە لە بەندایەتی کـردن و گـوێ ڕایـەڵی کـردن و لانـەدان لـە فەرمانـەکان و وازهێنـان و دوور کەوتنـــەوە لــە هــەموو پەرستراوێکی تر جگە لەخوا ﴿سـبيلي﴾ ڕێگـاو بانگەکـەی منـە ﴿أدعـوا الى الله﴾ بانگـەواز دەکەم بۆ لای خوای پەروەردگار ﴿على بصيرة﴾ لەسەر چاوساغی‌و یەقین و تەوحیدو زانیـاری‌و لێزانی‌و بینایی ﴿أنا ومن اتبعني﴾ خۆشم و ئەوانەش کـە شـوێنم دەکـەون و بەڕاسـتم دەزانـن و ئیمانم پێ دەهێنن بانگەوازی دەکەن بۆ لای خوا بەهـەمان شـێوە لەسـەر چاوسـاغی‌و یـەقین و تەوحیدو زانیاری‌و لێزانی‌و بینایی ﴿سبحان الله﴾پاکی‌و بەرزی‌و بڵندی‌و بێ عــەیبی بـۆ خـوای گەورەیـە لـەوەی هـاوەڵێکی لـە موڵـک و سـامان یـان لـە دەسـەڵاتیدا هـەبێ ﴿وما أنـا مـن المشركين﴾ وە من بەریم لە هاوبەش پەیدا کەران و نە من لەوانم و نە ئەوانیش لە منن.

لەم ئایەتە پیرۆزەدا: چەند ئەرک و فەرمانێک هەیە پێویستە لەسەر بانگخواز پێش ئــەوەی دەست بکات بەکاری بانگەوازی دەبێ دەستە بەریان بکات، ئەو ئەرک و فەرمانانەش ئەمانەن:

### یەکەم: ناسین و شارەزابوونی ئەو ڕێگایەی گرتویەتیە بەر کە ئیسلامە، پێش ئەوەی کەسانی تری بۆ بانگ بکات.

لەسەر بانگخواز پێویستە پێش ئــەوەی دەسـت بکـات بـەجێ بـەجێ کردنـی پێویسـتەکانی بانگەوازی کردن دەبێ لە ڕێگای قورئانی پیرۆزو سوننەتی صحیحەوە شارەزایی تەواو لە دینــی

---

[285] يوسف/١٠٨

ئیسلام پەیدا بکات و پاشان بەسەر خۆیدا جێ بەجێی بکات و کردەوەی پێ بکـات، کـەوا بـوو یەکەم جار زانست دێ ئەمجار گوفتار پاشان کردەوەو کار پـێ کـردن، چونکـە ئەگـەر کەسـێک بیەوێت بانگەوازی بکات، لەکاتێکدا ڕێگا ڕاستەکەی خۆی نەناسـیبیو شـارەزای نـەبووبێ ئـەو کاتە لەبری ئـەوەی خـەڵکی چـاک بکـات وبیانخاتـە سـەر ڕێگـا ڕاسـتەکە زیـاتر سـەریان لـێ دەشـێوێنێو تووشـی سـەرگەردانیان دەکـات عـەرەب گوتـەنی (**کیـف یسـتقیم الظـل والعـود أعوج**)و (**فاقد الشيء لا یعطیه**) بەڵکو بـەهۆی نـەفامیو نەشـارەزابوونی بەرامبـەر کاروبـاری دینەکەی خۆیشی سەر لێشێواوو گومڕا دەبیو دەبێتـە هۆیـەکیش بـۆ گومڕابوونـی خەڵکەکـە، لەجیاتی ڕێ نیشان دانیان بۆ سەر ڕێگای ڕاستی ئیسلام. لەبـەر ئـەوەی ڕێگـاو ڕێبـازو تولـەڕێ گەلێک زۆرن و سەرەنجامی هەمووشیان ئاگری دۆزەخە جگە لەیەک ڕێگـا ـەبێت کـە ئـەویش بریتییە لە ڕێگای خوای پەروەردگار، کە هەر ئەوەشیان ڕێگایەکی ڕاستەو سەرەنجامیشـی بـە بەهەشت کۆتایی دێت، ﴿**وان هذا صراطي مستقیماً فاتبعوه ولا تتبعوا السبل فتفرق بکم عن سبیله ذلکم وصاکم به لعلکم تتقون**﴾[٢٨٦]

واتە/ (بێ گومان ئەوە ڕێگا ڕاستەکەی منەو شوێنی کەون، نەکەن بـەدوای ڕێچکـەو تولـە ڕێگان بکەون کە دەبێتە هۆی لادانتان لەو ڕێگا ڕاستە بەمە وەسـیەت و ئامۆژگاریتـان دەکـەم تاوەکو ئاگادارو خۆپارێزبن).

جا پێویستە لەسـەر بـرای بـانگخواز دیراسـەیەکی وردو قووڵـی قورئـانی پـیرۆزو سـوننەتی **صحیحی** پێغەمبەرﷺ بکات بۆ ئەوەی بتوانێ بەباشی سەر لا ئیسـلام دەربکـات و لێـی تـێ بگات و بزانێ مانای ئیسلام و ئیمانی ڕاسـتەقینە چییـە، کـە سیسـتەم (**نظـم**)ێکـی گشـتیو یاسایەکی هەمە لایەنەی کاروبارەکانی ژیانەو بەرنامەو ڕێبازێکی ڕێک و پێکە بۆ مرۆڤەکان و پێغەمبەرﷺ لە لایەن پەروەردگارەکەیەوە هێناویەتیو فـەرمانی پـێ کـردووە بـە خەڵکەکـەی ڕابگەیەنیو لەگەڵ پاداشت و سزای ئەو کەسانەی شوێن کەوتووی دەبن یاخود سەرپێچی دەکەن، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿**ومن یبتغ غیر الاسـلام دینـاً فلـن یقبـل منـه وهـو في الآخـرة مـن الخاسرین**﴾[٢٨٧]

---

[٢٨٦] الانعام/١٥٣

[٢٨٧] آل عمران/٨٥.

واتە/ (هەر کەسێک چ ئێستاو چ لە داهاتوودا جگە لە ئیسلام دینێکی تر هەلبژێریو بیکاتە پەیڕەوو پرۆگرامی خۆی ئەوە لێی وەرناگیریو لە ڕۆژی دوایشدا لە دۆڕاوەکان دەبێ).

هەروەها خوای گەورە قورئانی پیرۆزی بەڕۆح ناو بردووە کەوابوو ئینسانی کامڵ و ژیر نابێ بەبێ ئەم ڕۆحە کە بریتییە لە قورئان بەڵکو لە جیهانی ئینسانیەت دەردەچیو دەچێتە جیهانی ئاژەڵ و حەیوانەوە ﴿والذين كفروا يتمتعون ويأكلون كما تأكل الأنعام والنار مثوى لهم﴾[288]

یان دەفەرموێ: ﴿أولئك كالأنعام بل هم أضل﴾[289]

واتە/ (ئەوانە وەکو ئاژەڵ وان بەڵکو لە ئاژەڵیش گومڕاترن).

هەروەها ئەم قورئانە نوورێکەو بەهۆیەوە ئینسان ڕێگای ڕاستی بۆ ڕووناک دەبێتەوەو بەرچاوی ڕۆشن دەبێ، بۆیە پێویستە لەسەر برای بانگخواز دوای ئەو نورە خواییە بکەوێ تاوەکو بەهۆیەوە ڕێگای ڕاست بدۆزێتەوەو بیناسیو شوێنی بکەویو پاشان خەڵکیشی بۆ بانگ بکات هەر ئەوەشە ڕێگای ڕاستی پەروەردگار ﴿وكذلك أوحينا اليك روحاً من أمرنا ما كنت تدري ما الكتاب ولا الايمان ولكن جعلناه نوراً نهدي به من نشاء من عبادنا وانك لتهدي الى صراط مستقيم، صراط الله الذي له ما في السموات وما في الارض الا الى الله تصير الامور﴾[290]

## دووەم/ بانگەوازی کردنەکە بۆ خوای تاک و تەنها بێ:

دەبێ بانگەوازی کردن تەنها بۆ لای خوای گەورە بێو هەر لەپێناوی ئەویشدا بێ چونکە زۆر لەو کەسانەی بانگەوازی دەکەن بانگەوازییەکەیان بۆ خۆیانەو بۆ خۆ دەرخستنە یان بۆ زیاد کردنی ڕێژەی کۆمەڵەکەیانە بەبێ گوێ دانە پابەند بوونیشیان بە شەرعەوە بەمە یەکێ لە مەرجەکانی قبوڵ بوونی کردەوە کە دڵسۆزیو لەبەر خوا کردن (إخلاص)ە پشت گوێ دەخرێت و ئەو کاتە زۆربەری موسڵمانان جۆرێک لە جۆرەکانی هاوبەش بڕیاردان (شرک) تێکەڵی دڵەکانیان دەبێ. کەوا بوو ئیمانی پاک پێویستی بە هۆشیاریو ئاگادارییەکی بەردەوام هەیەو

---

[288] محمد/١٢

[289] الاعراف/١٧٩

[290] الشورى ٥٢-٥٣

دەبێ دڵەکان لە هەموو گومانێکی شەیتانی بپارێزرێن و هەروەها دەبێ هەموو جوڵەو هەڵس و کەوتەکان لە ژیاندا حیسابیان بۆ بکرێت، تاکو گشت کارو کردەوەکان بە پاکیو ساغی بۆ خوای تاک و تەنها بێ جگە لەو بۆ کەسێکی تر نەبن، هەروەها پێویستە لەسەر بانگخواز لە هەموو جۆرە هاوبەش بڕیاردان (شرک)ێک دوورە پەرێز بێ، ئەوەتە پێغەمبەرﷺ ئومەتەکەی لێ ئاگادار کردۆتەوە نەوەک تێی بکەون وەکو ئیمامی احمد دەفەرموێ:(**أخوف ما أخاف عليكم الشرك الأصغر قالوا: وما الشرك الأصغر يا رسول الله؟ قال: الرياء. يقول الله تعالى يوم القيامة اذا جاء الناس بأعمالهم اذهبوا الى الذي كنتم تراؤن في الدنيا هل تجدون عندهم جزاءاً؟**).

واتە/ (لە هەموو شتێک زیاتر لێتان بترسم بچوکترین شرکە گوتیان: بچوکترین شرک و هاوبەش بڕیاردان چی‌یە ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: ڕووپامایی کردن (ریاء)ە ڕۆژی دوایی کاتێ خەڵکی بەخۆیان و بەکردەوەکانیان دێن، خوای گەورەو بەرز پێیان دەڵێ: بڕۆنە لای ئەو کەسانەی کردەوەکانیان بۆ ئەنجام داون لای ئەوان پاداشت وەربگرنەوە).

هەروەها ئەبو هورەیرە -خوا لێی رازی بێ- دەڵێ: پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ:[(**يقول الله**) **أنا اغنى الشركاء من عمل عملاً أشرك معي غيره تركته وشركه**][291]

واتە/ (خوای گەورە دەفەرموێ: من زۆر لەوە دەوڵەمەندترم لەوەی شەریکم هەبێ جا هەر یەکێ کردەوەیەکی کردو تیایدا یەکێکی تری کردە شەریک لەگەڵ من ئەوا وازی لێ دەهێنم بەخۆیو هاوبەشەکەشیەوە).

هەروەها ئیمامی ئەحمەد ڕیێوایەت دەکات (ئەبو سەعیدی کوڕی فەضالە) دەڵێ لە پێغەمبەرﷺم بیست دەیفەرموو: (**اذا جمع الله الأولين والأخرين ليوم لا ريب فيه، يناد مناد: من كان أشرك في عمل عمله لله فليطلب ثوابه من عند غير الله فان الله أغنى الشركاء عن الشرك**)[292]

واتە/ کاتێک خوای گەورە ئەوەڵ و دواینەکانی کۆ کردەوە لەو ڕۆژەی کە هیچ گومانی تێدا نی‌یە بانگ کەرێک بانگ دەکات: هەر کەسێ لە کردەوەیەک لەو کردەوانەی کردوویەتی

---

[291] رواه مسلم.

[292] صحيح رواه احمد.

تیایدا یەکێکی تری کردۆتە شەریکی خوای گەورە با داوای پاداشت لە غەیری خوا بکات، چونکە خوای گەورە زۆر لەوە دەوڵەمەندترە کە شەریکی بۆ بڕیار بدرێ).

جا کەوابوو با ژیانمان و مردنمان بۆ وەدەست خستنی ڕەزامەندی خوای تاک و تەنها بێ‌و جگە لەو بۆ کەسی تر نەبێ، لەوانەش بانگ کردنەکەمان بۆ ئەوەی لەو کەسانە نەبین کە بەهۆی کردەوەکانیان خۆیان دۆڕاندوە.

بەڵکو لەو کەسانە بین کە خوای کارلەجێ دەربارەیان دەفەرموێ: ﴿**اني لا أضيع عمل عامل منكم من ذكر أو أنثى بعضكم من بعض**﴾[293]

واتە/ (من کردەوەی هیچ کەسێک لە ئێوە بەزایە نادەم چ لە پیاوان چ لە ئافرەتان بەبێ جیاوازی کردن پاداشت دەدرێتەوە).

## سێیەم/ چاوساغی‌و ڕۆشنی ((بصيرة))

بێ گومان (**بصيرة**) یەکێکە لە فەرزەکان تاکو و بابەتەکانی بانگەوازی کردن تێکەڵی بابەتەکانی ترو بیرۆچکەکانی تر نەبێت و کۆمەڵی بانگخوازان بۆ خوا بەهەر جۆرێک بێ دەبێ لەیەکتریان جیا بکەنەوەو دەبێ جاڕی ئەوە بدەن کە بەتەنها ئوممەتێکن جیاوازن لەو کەسانەی هاوبیرو هاوڕێبازی ئەوان نین و لەیەک جودا دەبنەوەو تێکەڵیان نابن، هەروەها نابێ ڕێگە بدەین خاوەنانی ئەم دینە بانگەوازی بکەن بۆ دینەکەیان لە کاتێکدا خۆیان تواندۆتەوە لەناو کۆمەڵگای نەفامی (**المجتمع الجاهلي**) بە بیانووی بەژەوەندی بانگەوازی کردن (**مصلحة الدعوة**) کە ئەم جۆرە بانگەوازی کردنە هیچ بەرهەمێکی بەنرخی نابێ، کەوا بوو هەر دەبێ جاڕی ئەوە بدەن کە ئەوان شتێکن و نەفامیش شتێکی ترەو دەبێ بەکۆمەڵ بوون (تجمع)ێکی تایبەتی‌و خاوەن عەقیدەیەکی خاوێن و ڕێک جودا بکرێتەوە، نەک وەکو هەندێ کەس کە ئیسلام تێکەڵی بەرنامە دروست کراوەکان و بیرۆچکەکانی تر دەکەن ئەوانە لەناو ئەو بارودۆخەدا تواونەوەو لە سروشتی ئەم دینە نەگەیشتوونەو چۆنیەتی چوونە ژوورەوەی دەرگای دڵەکان نازانن چۆنە!!

دەبینین خاوەن بیرو بۆچوونە کوفرو ئیلحادیەکان زۆر بەگەرمی‌و بە جورئەتەوە خۆیان دەردەخەن و بەئاشکرا بیروبۆچوون و بەرنامەی خۆیان ڕادەگەیەنن!! لە کاتێکدا بیرو

---

[293] آل عمران/١٩٥

بۆچوونەکەیان بەتاڵ و مایە پووچە. ئەدی بۆچی خاوەن بانگەوازانی ئیسلام ئەگەر چی لەسەر بەرنامەیکی حەق و ڕێگاو ڕێبازێکی ڕاستن ناوو نیشانی تایبەتی خۆیان ناشکرا ناکەن و ئەو ڕێگاو ڕێبازەی کە جیاوازیەکی تەواوی لەگەڵ ڕێگاکانی تری نەفامیدا هەیە بەناشکرا دەری نابڕن؟! لە کاتێکدا کە پێغەمبەرﷺ ئەوپەڕی ڕوون و ئاشکرایی لە دەعوەکەیدا هەبوو بۆیە بە شانازییەوە دەیگوت: ﴿لا أعبد ما تعبدون﴾[294] کە هەر لەیەکەم پیتی سەرەتاییەوە نەفی هەموو (أنداد وأرباب وآلهة وطواغيت)ی دەکردو دروشمی هەمیشە زیندووی نەخێر بوو بۆ نەفامێتیو نەفامان و پاشان إثباتی پەرستراوو خوای ڕاستەقینەی دەکرد کە لە وشەی (الا اﷲ)دا خۆی دەنوێنێ چونکە ئەم ڕستە پیرۆزە (لا اله الأ اﷲ) لەسەر دوو بناغە دادەمەزرێت:

١- ڕووخاندن و ڕەخنەگرتن و نەخێرکردن بۆ نەفامێتیو جاهیلیەت و باطل و ڕێچکەو بیرۆچکە مرۆییەکان و دروست کراوە نادەمیزادیەکان.

٢- بیناکردن و پەخش کردنی هەق و ڕاستیو دیاری کردنی ڕاست وترین باوەڕو بەرنامەو ڕێباز.



| لا اله | الاّ ا ﷲ |
| --- | --- |
| نفي الجاهنية<br>هدم الباطل<br>نقد الواقع القائم | اثبات حقيقة الاسلام<br>بناء الاسلام<br>عرض الحق |

بەڵام دیارە پێش ئەوەی نەخێرو نەفی (لا) بڵێ بە نەفامێتیو جاهیلیەت چاک ڕەگ و ریشاڵی دەناسی ئنجا دەیفەرموو نەخێر بۆ باطل و جاهیلیەت هەر بۆیەش عمری کوڕی **خطاب** -خوا لێی رازی بێ- دەفەرموێ: (**انما تنتقض عرى الاسلام عروة عروة اذا نشأ في الاسلام من لم يعرف الجاهلية**).

واتە/ ((کاتێک ئیسلام کەلو کەلو لەبەریەک هەڵدەوەشێت (هەڵدەوەشێنرێت) کاتێک کە لەناو ئیسلامدا پێ بگات کەسێک بەڵام نەفامیو جاهیلیەت نەناسێ)).

---

[294] الكافرون/٢

هەر بۆیەش زانایان گوتویانە (**تعرف الاشياء بأضدادها**).

واتە/ شتەکات بەدژی خۆیانەوە دەناسرێن.

***جۆرەکانی چاورۆشنیو بەصیرەت:***

١- بەصیرەت بەو بەرنامەی کە خەڵکی بۆ لا بانگ دەکرێت لە ڕووی حەڵاڵ و حەرام و... هتد. چونکە کەسێک خۆی حاڵی وشارەزا نەبێت لە ئیسلام ناتوانێ خەڵکی تری لێ حاڵی بکات (**فاقد الشيء لا يعطيه**). واتە: ئەوەی شتێکی نەبێ ناشی بەخشێ.

٢- بەصیرەت و شارەزایی بوون بەوە کەسانەی کە بانگ دەکرێن لە ڕوویو دەروونیو سروشت و داب و نەریت و گیروگرفت و... هتد. هەروەکو پێغەمبەرﷺ فەرمووی بە (**معاذ**) کاتێ کە ناردی بۆ (یمن) ((**انك تأتي قوماً من (أهل الكتاب) فادعهم الى شهادة ان لا اله الاّ الله واني رسول الله، فان هم اطاعوا لذلك فاعلمهم ان الله افترض عليهم خمس صلوات في كل يوم وليلة، فان هم اطاعوا لذلك فاعلمهم ان الله افترض عليهم صدقة تؤخذ من أغنيائهم فترد على فقرائهم، فان هم اطاعوا لذلك فاياك وكرائم امواهم**))[٢٩٥]
واتە/ بێ گومان تۆ دەچیتە ناو گەلێک کە لە ئەهلی کتابن.. واتە جوو و فەلەن..!! ئنجا بانگیان بکە بۆ... هتد.

٣- بەصیرەت بوون بە شێوازو چۆنیەتی بانگەوازی کردن. هەروەکو خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿**ادع الى سبيل ربك بالحكمة والموعظة الحسنة وجادلهم بالتي هي احسن...**﴾[٢٩٦] واتە: ئەی پێغەمبەری خوا بانگەوازی بکە بۆ لای ڕێگەی پەروەردگارت بە کارزانی ولێزانینەوە وە ئامۆژگاری جوان...

٤-بەصیرەت بوون بە نەفامیو ڕێگای نەفامان و فێڵەکانی شەیتان و دوژمنان هەروەکو حوزەیفە دەفەرمووێ خەڵکی پرسیاریان لە پێغەمبەرﷺ دەکرد دەربارەی چاکەو خێر بەڵام من لە خراپەو شەڕ پرسیارم دەکرد لە ترسی تووش بوونی، هەر بۆیە عمری کوڕی خەتتاب دەفەرمووێ: (**انما تنتقض عرى الاسلام عروة عروة اذا نشأ في الاسلام من لم يعرف الجاهلية**) واتە کاتێک ئیسلام کەلو کەلو لەبەریەک هەڵدەوەشێنرێ کە کەسێک لەناو ئیسلامدا پێ

---

[٢٩٥] متفق عليه (فتح الباري ج١٣ ص٣٤٧ وصحيح مسلم بشرح النووي ج١ ص١٩٦

[٢٩٦] النحل/١٢٥

بگات و نەفامیو جاهلیەت نەناسێ، وە هەروەها ﴿غير المغضوب عليهم ولا الضالين﴾یش ئاماژەیە بۆ لێکۆڵینەوەو شارەزایی بوون لە جوولەکەو گاورەکان و پەیرەوی کەرانیان و هۆیەکانی گومڕابوون و کافربونیان.

## چوارەم: خۆبەری کردن لە ئەهلی شرک:

پێویستە لەسەر بانگخوازان جاڕی خۆبەری کردن بدەن لە ئەهلی شرک و موشریکان ئەوانەی بەردەوام لە جەنگ دان دژی خواو پێغەمبەروﷺ شەریعەتەکەی ئەگەر چی نزیکترین کەسیشیان بێ خوای باڵادەست دەفەرموێ ﴿لا تجد قوماً يؤمنون با لله واليوم الآخر يوادون من حاد ا لله ورسوله ولو كانوا آباءهم أو ابناءهم او اخوانهم او عشيرتهم﴾[297]

واتە/ (گەلێکت دەست ناکەوێت کە باوەڕی بەخواو بە ڕۆژی دوایی هەبێت و ئەو کەسانەیان خۆش بوێت و پشتگیریان بکەن کە دژایەتی خواو پێغەمبەرەکەی دەکەن، با ئەو کەسانەش باوکیان یان کوڕیان یان برایان یان هۆزو عەشیرەتیان بن).

پاش خۆبەری (البراءة) کردن لە شرک و ئەهلی شرک کە ئەمە سەرەتاو کۆتایی ئیسلامە پێویستە لە سەریان ئەم ڕاستیەیە بۆ خەڵکە کە ڕوون بکەنەوەو ئاگادارییان بکەنەوە، چونکە ئیسلام لەسەر دوو کۆڵەکە بنیات نراوە وەکو باسمان کرد یەکیان بێ ئەوی تریان وەرناگیرێ..

یەکەمیان: بریتییە لە نەفی کردنی (خوایەکان -آلهة- و ئەندادو ئەرباب و تاغوتەکان) بە مانای کوفر کردن پێیان و خۆبەری کردن لێیان واتە (لا اله).

دووەمیشیان: بریتییە لە سەلماندنی خوایەتی (الوهية) خوای پەروەردگار.

واتە/ دروست کەرو ڕۆزی دەر هەر ئەوەو هەر ئەویشە دەمرێنیو دەژێنێنیو لەکاتی خۆشیداو ناخۆشیدا پشتی پێ دەبەستریو حاکم و دەستورو یاسادانەریش هەر خۆیەتی واتە (الاّ ا لله) خوای کارلەجێ دەفەرموێ: ﴿فمن يكفر بالطاغوت ويؤمن با لله فقد استمسك بالعروة الوثقى لا انفصام لها﴾[298]

واتە/ هەر کەسێک کوفر بە طاغوتان بکات و ئیمان بە خوایەتی خوای پەروەردگار بێنێ ئەوا دەستی گرتووە بە پەتێکی زۆر بەهێز بە جۆرێک کە هەڵوەشانەوەو بچڕانی بۆ نییە، ئەو

---

[297] المجادلة/٢٢

[298] البقرة/٢٥٦

پەتەش بریتی‌یە لە (لا الە الا ا للە).

هەروەها خوای گەورە دروست کراوەکانی خۆی دابەش کردووە بۆ دوو بەش:

یەکەمیان: بریتی‌یە لە (سفیهـ) کە نی‌یە لەو سەفیهو گەمژەتر لەبەر ئەوەی خۆی بۆتە هۆی گەمژەکردنی خۆی.

دووەمیان: بریتی‌یە لە (رشید).

گەمژە (سەفیهـ) ئەو کەسەیە لە تەوحید لا دەدات بۆ شرک، پێگەیشتوو (رشـید)یـش ئـەو کەسەیە خۆی دوورەپەرێزو بەری دەکات لە شـرک جـا چ بـە گفتـار بێـت یـان بـەکردار. واتـە/ گفتارو کردارەکانی لەسەر تەوحیدە.

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ومن یرغب عن ملة ابراهیم الا من سفه نفسه﴾[299]

واتە/ (کێیە خۆی لا دەدات و پشت هەڵدەکات لە ئاینی ئیبراهیم مەگەر کەسێک نـەبێت کە خۆی سوک و چروک وگەمژە کردووە).

ئنجا با بیرکردنەوە لە ئامۆژگاری ئەو پیاوەی کە پێغەمبەرﷺ دوعای بۆ کـرد کـە خـوای گەورە لە دین زاناو شارەزای بکات ئەویش (عبداللەی کوڕی عباس)-خوا لێی رازی بێ- کاتێ پیاوێک هاتە لای پێی گوت: (من دەمەوێ ئەمر بە چاکەو نەهی لـە خراپـە بکـەم) عبـدا للە گوتی: (دەتەوێ بیگەیتێ؟ پیاوەکە گوتی هیواخوازم!!

عبدا للە گوتی: ئەگەر ئەو سێ ئایەتەی خوای گـەورەت لەسـەر خـۆت جـێ بـەجێ کـردووە دەتوانی ئەم کارە جێ بەجێ بکەی.

پیاوەکە گوتی: ئەو سێ ئایەتانە چین؟

گوتـی: یەکـەمیان ئەوەیــە کــە خــوا دەفــەرموێ: ﴿أتـأمرون النـاس بالـبر وتنسـون أنفسکم...﴾[300]

ئایا ئەمەت جێ بەجێ کردووە؟

گوتی: نەخێر.

عبدا للە گوتی: دووەمیان ئەوەیە کە خوا دەفەرموێ: ﴿لم تقولون ما لا تفعلون کـبر مقتـاً

---

[299] البقرة/١٣٠

[300] البقرة/٤٤.

**عند ا لله ان تقولوا ما لا تفعلون﴾**[٣٠١]

ئايا ئەمەت جێبەجێ کردووە؟

گوتی: نەخێر.

عبدا لله گوتی: سێیەمیشیان گفتاری بەندەی چاکەکار (شعیب) پێغەمبەرە (سەلامی خوای لی بێ) کاتێ بە گەلەکەی گوت: **﴿وما أريد ان اخالفكم الى ما أنهاكم عنه ان اريد الا الاصلاح ما استطعت﴾**[٣٠٢]

ئایا ئەمەت جێ بەجێ کردووە؟

گوتی: نەخێر.

عبدا لله گوتی: کەواتە یەکەمجار لە خۆتەوە دەست پێ بکە.

✻ **سید قطب** (رەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێ: ((گەر کەسانێک هەبوون و خۆیان بە موسڵمان دەزانیو ڕادەنواند، بەڵام دژایەتی ستەمیان نەکردووەو بەرەنگاری ستەم کاران نەبوونەوەو هەوڵیان نەدەدا لەسەر چەوساوان بکەنەوەو رازی بوون زیندان و بەندیخانەکان ببنە مۆڵگەو لانەی بێ نەوایان ئەوا ئەو کەسانە یان لە ئاینی خوا بێ ئاگان یان دووڕوو و مونافیقن))[٣٠٣]

---

الصف/٢ - ٣

هود ٨٨

بڕوانە هەڵوێست ژمارە ٩

# وانەی حەوتەم:

## ﴿الم. أحسب الناس ان يتركوا أن يقولوا آمنا وهم لا يفتنون، ولقد فتنا الذين من قبلهم فليعلمن الله الذين صدقوا وليعلمن الكاذبين﴾[٣٠٤]

واتە/ (ئایا خەڵکی وا دەزانن لێیان دەگەڕێین بەزمان بڵێن ئێمە بڕواداریـن و تاقییان ناکەینەوە بەڵکو دەبێ تاقی بکرێنەوە بە هەموو جۆرە تاقی کردنەوەیەک بۆ ئەوەی کەسانی ڕاستگۆ لە کەسانی درۆزن جیا بکرێنەوە).

بێگومان ئەوە دەستورێکی خوایی‌یە کە بڕواداران تاقی دەکاتەوە، ئەوەتا هەموو موسڵمانان و شوێن کەوتوانی پێغەمبەرانی پێش ئێمەی تاقی کردۆتەوە بۆ ئەو مەبەستەی لە سەرەوە ئاماژەی بۆ کرا واتە جیا کردنەوەی ڕاست گۆ لە درۆزن، وە دڵسۆزان لە مونافیقان.

ئەم سورەتە لە مەککە دابەزیوە بۆ پێگەیاندنی ئەوانەی بڕوایان بە پێغەمبەر هێنا بوو بۆ ئەوەی بیان کات بە نەوەیەکی نموونەیی‌و پێشەنگ بۆ نەوەکانی ترو ئەوانەی پاش خۆیان چاویان لێ بکەن و شوێن پێیان هەڵگرن، ئەمەش شتێکی پێویستە و لەگەڵ سروشتی ئەرکی سەرشانی ئەو نەوەیەدا دەگونجێ کە دەبێ بە بناغەو بنچینە بۆ نەوەکانی داهاتوو وە شارستانێتی ئیسلامی لەسەر شانی ئەوان دادەمەزرێت بۆ ئەم مەبەستەش خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ما كان الله ليذر المؤمنين على ما أنتم عليه حتى يميز الخبيث من الطيب وما كان الله ليطلعكم على الغيب﴾[٣٠٥]

واتە/ (خوای گەورە لەبڕواداران ناگەڕێت تا پاک و پیسیان لەیەک جودا نەکاتەوە، ئەویش بە جۆرەها تاقی کردنەوە).

بەو شێوەیە قورئان لەماوەی بیست و سێ ساڵدا کۆمەڵێکی پەروەردە کرد کە ئەو کاتەی

---

[٣٠٤] العنكبوت/١-٣

[٣٠٥] آل عمران/١٧٩

پێغەمبەری خواﷺ دونیای بەجێ هێشت بەتەواوی بۆ ئیسلام یەکلا بوونەوە، ئەگەر وا نەبایە هەرگیز ئیسلام بڵاو نەدەبوەوە وە هەر زۆر دەمێک بوو ئیسلام بەسەر یەکدا تێک درابوو، بەڵام لە ئەنجامی ئەو هەموو تاقی کردنەوە وە ئەو نەوە نموونەیی‌یە پەیدا بوو، ئەمیش وەکو گوتمان شتێکی ئاسایی‌یەو لەگەڵ سروشتی ئەم ئاینەدا دەگونجێت بە تایبەتی کە ئیسلام دوا بەرنامەی خوایی‌یەو پاش پێغەمبەری ئازیزﷺ هیچ پێغەمبەرێکی تر نایەت و ئەرکی گەیاندنی ئیسلام دەکەوێتە ئەستۆی شوێن کەوتوانی.

ئەمڕۆکەش کە دەمانەوێ ئیسلام لەو غوربەتەی تێی کەوتووە دەربێنین و خەڵکی بگێڕینەوە بۆ ئیسلام، دەبێ بەهەمان ڕێگای یارانی پێغەمبەرداﷺ بڕۆین و دەبێ تووشی جۆرەها تاقی کردنەوە ببین بۆ ئەوەی پاک وپیسی ئێمەش لەیەک جودا بکرێنەوەو ئەو نەوەیەی دەبێتە بناغەیەک بۆ ئەم شارەستانی‌یەتە تازەیەی ئیسلام نەوەیەک بێت زۆر نزیک لە نەوەی یەکەمەوە کە خوا بەو شێوەیەو بە جۆرەها تاقی کردنەوە پەروەردەی کردن.

ئێمە زۆر هەڵەین گەر بمانەوێت مەبەستەکانی ئیسلام بەدەست بێنین بێ ئەوەی دووچاری ناڕەحەتی‌و تەنگ و چەڵەمەو تاقی کردنەوە بین، بۆیە پێوستە موسڵمانان لەسەر ئەوە پەروەردە بکرێن کە خۆیان ئامادە بکەن بۆ تاقی کردنەوەو ناڕەحەتی چونکە ئەوە شتێکی حەتمی‌یە بۆ کەسانێک کە بیانەوێت ئیسلام بەرپا بکەنەوە وەکو ئیمامی شافعی -ڕەحمەتی خوای لێ بێ- دەفەرموێت: (**لن تمكنوا حتى تفتنوا**). واتە/ باڵادەست نابن و سەرناخرێن تاکو تاقی نەکرێنەوە.

نابێ موسڵمانان وا تێ بگەن کە ئەگەر کۆمەڵێک تووشی ناڕەحەتی‌و تەنگ و چەڵەمەو کێشە هاتن ئەوا مانای وایە حیکمەت و داناییان بەکار نەهێناوە، چونکە کەس ئەوەندەی پێغەمبەران داناو کارزان نەبووەو هەموویان تووشی ناڕەحەتی بوون و هەندێکیان بە مشار دوو لەت کراون و هەندێکیان ئازاری (لاشەیی‌و دەروونی)، (**الجسدي والنفسي**) دراون و دەیان ناوو ناتۆرەیان لێ نراوەو لە وڵاتانی خۆیان دەربەدەر کراون و بە شێت و دێوانەو گێرەشێوێن و ئاژاوەچی لەقەڵەم دراون!!

جا داواکارین لە خوای گەورەو بەدەستەڵات کە تووشی تاقی کردنەوەی سەخت و دژوارمان نەکات وە ئەگەر تاقی کردنەوەو بەڵای سەخت هات بەسەرماندا خوای گەورە بەبەزەیی خۆی سەرمان بخات و سەرکەوتوومان کات بەسەریدا.

## وانەی هەشتەم:

﴿...والذين اذا ذكروا بآيات ربهم لم يخروا عليها صماً وعميانا والذين يقولون ربنا هب لنا من ازواجنا وذرياتنا قرة أعين واجعلنا للمتقين اماماً، اولئك يجزون الغرفة بما صبروا ويلقون فيها تحية وسلاماً خالدين فيها حسنت مستقراً ومقاماً﴾[306]

واتە/ (یەکێکی تر لە نیشانەکانی بەندە خوا ناسەکان و بەندەکانی خوای بەزەیی فراوان (عباد الرحمن) ئەمەیە:

هەر کاتێک فەرمایشتی خوایان بخرێتەوە یادو بدرێت بەگوێیاندا بە کەرِو کوێری ناکەون بەرِوودا، وە هەروەها کەسانێکیشن کە دەڵێن پەروەردگاری ئێمە پێمان ببەخشە بە خاوو خێزان و وەچەکانمان کەسانێک کە ببنە مایەی خۆشیو ئاسوودەییو شادمانی دڵ و دەروونمان بە جۆرێک بەدیتنیان چاومان رۆشن ببنەوە، وە خوایە گیان بمانگێرِی لەو کەسانەی کە دەبنە پێشرەوو پێشەوای لەخوا ترسان، ئنجا ئەو خواناس و برِوادارو پیاو چاکانە لە لایەن پەروەردگاریانەوە پاداشت دەدرێنەوە بە بەهەشتی رازاوەو (**غرفة**) یان پێشکەش دەکرێت کە مەبەست پێی بەهەشتە یا شوێنێکی تایبەتیە لە بەهەشتدا لە پاداشتی ئەوەی کە لەسەر ئەو رەوشتە بەرزانەو لەسەر بەندایەتی کردنی راستەقینە ئارامیان گرت، ئنجا لەو شوێنە تایبەتیەدا کە (بەهەشتە)بە سەلام پێشوازییان لێ دەکرێ، کە بە هەتایی لەو بەهەشتەدا دەمێننەوە، کە بەراستی چاکترین و جوانترین شێوەی دامەزران و نیشتەجێ بوون و مانەوەیە تێیدا.

دیارە بەندە خواناسەکان ئەوەندە خۆشەویستی خواو رێبازە شیرینەکەیان بەدڵدا چووە، ئەوەندە شادمانن کەوا رێگای سەرفرازییان گرتووەو -بە پشتیوانی خوا- لە هەردوو ژیاندا

---

[306] الفرقان/٧٣-٧٦

رزگارو سەربەرزن، هەر بەوەوە ناوەستن خەریکی خـوا پەرسـتیو شـەونوێژی بـن و ئـەو هـەموو ناونیشانە گەورانەیان پێوە بیو لە ژیانی خۆیـان و کۆمـەڵی ئیمانداریـان رازاندبێتـەوە، بـەڵکو ئاواتەخوازن کە خوای گەورە منداڵ و وەچەو بەرەیەکی ئەوتۆیان پێ ببەخشـێ کـە وەك خۆیـان خواناس بن لەسەر رەوتی خۆیان بـڕۆن، هـەروەها ژن و خـێزانێکی وەهایـان پـێ ببەخشـێ وەك خۆیان ڕوو لە خوا بن و مەبەستی ژیانیان پەرستنی خوا بەتاك و تەنیاو خزمەت کردنـی ئـاینی خوا بێت، تا ئەمانیش بە بینینـی ئـەو ژن و منداڵانـەیان چاوەکانیـان رۆشـن ببنـەوەو خۆشـیو ئاسوودەییو شادمانی بەدڵیان بگات... ئەمەش بۆ ئەوەی:

یەکەم/ ژمارەی بەندە خواناسەکان زیـاتر بێـت و ئـاینی خـوا هـەڵگری زۆربـیو زیـاتر لـە ئادەمییەکان رزگار ببن.

دووەم/ وەك حەزدەکـەن خۆیـان سـەرفرازی هـەردوو ژیـان بـن وەهـاش حـەز دەکـەن ژن و منداڵەکانیان سەرفراز بن.. وە دیسان لەخوا دەپاڕێنەوە تا بیانکاتە نموونەو پێشەنگێکی پـاك و بێ گەرد بۆ ئەوانەی کە شەرم و ترسی خوا وا لە دڵیاندایە ﴿**واجعلنـا للمتقين اماماً**﴾. بـەم شێوەیە خواناسان ئەوەی لەناو دڵە پڕ لە ئیمانەکەیاندا شاراوەتەوە دەری دەخەن.. دەری دەخەن کە چ ئاواتێك وا لە دڵیاندایە.

پێش هەموو شتێ حەزیان لەوەیە ئادەمییەکان بگەڕێنەوە بـۆ لای پـەروەردگارو لـە سـزای سەختی دۆزەخ ڕزگاریان بێت و بەهەشتی بەرینی نەبڕاوەیان لەکیس نەچێ.

ئینجا حەز دەکەن ژمارەی خواناسان لەسەر زەویدا زۆر بێ بە تایبەتی ژن و منداڵ، کـە لـە بارەی لێ پرسراوییەوە نزیکترین کەسن و یەکەم سپاردەیەکن لە گەردنی پیاوەکاندا.

هەروەها پێیان خۆشە خوا ئەوەندە بەخششی خۆی بڕژێنێ بەسەریانداو ببنە جێی متمانـەی پەروەردگارو ئاینی پیرۆزی بە سپاردە پێیان خەڵات بکات ئادەمیزادەکان بەرەو خواناسی بـەرن و شوێن هەنگاوە پیرۆزەکانی ئەمان هەڵگرن، بـۆ دۆزینـەوەی رێبـازی ئیسـلامی پـیرۆز دیـارە ئەمەش هیچ خۆپەرستیو بەرزیو دەسەڵاتێکی تێدا نییە چونکە خواناسـە ڕاسـتەقینەکان هـەر کاتێ پێشەوایەتیو مامۆستایەتی موسڵمانانیان کردبێ بۆ ئەوە نەبووە ژیانی دونیایـان دەسـت کەوێت یان پلەو پایەی دەسەڵاتیان بکەوێتە ژێر دەست... بەڵکو تەنها مەبەست ڕەزامەندی خوا بووەو کۆمەڵی خواناسانیش هەموو بەجارێك بەرەو خۆشەویستی خوا کەوتوونەتە رێ..

لێرەدا ئەمە دەخەینە بەرچاوی موسڵمانان کە هەرکاتێ ویستیان خوای گەورە خێزان و منداڵی خواناسی گوێ ڕایەڵیان بداتێ، با بزانن ئەمە ئاواتی موسڵمانەو مافی خۆیانە داوای بکەن و یەکێکە لە ناونیشانەکانی کۆمەڵی خواناسان، بەڵام ئەوەتا قورئانی پیرۆز لەدوا دوای ناونیشانەکانیدا باسی کردووە، وەک بیخاتە بەرچاوی موسڵمانەکان و پێیان بفەرموێ: هەنگاو بەهەنگاو بە پەروەردە کردنی خۆتانەوە خەریک بن تا دەگەنە لای ئەم ئاوات و پاڕانەوەیە.. پەلە مەکەن... خۆتان چاک کەن ئەو کاتە خوای گەورە پاڕانەوەکەتان لێ وەردەگرێو خێزان و کۆرپەکانتان هیدایەت دەدرێن و کۆمەڵی خواناسیش بە پشتیوانی خوا پەرەدەستێنێ.. واتە خەریکی بانگەوازی کردن بن.. خۆتان وەها پەروەردە بکەن کە شایانی پێشەوایەتی (قیادەیی) بن، تا خوای گەورەش ئاواتەکانیان بۆ جێ بەجێ بکات.

ئنجا دوای ئەو ناونیشانە بەرزانە خوای گەورە مەنزڵ و شوێنی بەندەکانی دیاری دەکات و پاداشتیان دەداتەوە بە بەهەشتی بەرین و رازاوەو (**غرفة**)یان پێشکەش دەکات.. شوێنێک کە ڕێزو پایەیەکی یەکجار زۆری تێدا بێ بۆ ئەوانەی خاوەن ڕێزو پایەو پلەن بەلای خواوە.. میوان دارییەکی چاک دەکرێن.. پێشوازی دەکرێن چونکە ئەوانی خاوەنی ئەو ڕەوشت و ناوو نیشانە بەرزانە شایانی ئەوەن بەخێر هاتنیان لێ بکرێ.

لەو شوێنە تایبەتیەدا بە سەلام پێشوازییان لێ دەکرێ ئەمەش لە پاداشتی ئەوەدا کە لەسەر ئەو ڕەوشتە بەرزانە ئارامیان گرت.

بەڵێ خوڕازاندنەوەی کۆمەڵی خواناس بەو کردارە سەربەرزکەرەوانە ئارام و خۆگری دەوێ.. بەردەوامی لەسەر ڕەوشتی ئیسلامی دان بەخۆدا گرتنی دەوێ..

ئارام و دان بەخۆداگرتن لەسەر ئارەزوواتی دەروون و ڕاکێشان و دڵ فریودانی ژیان.. پاڵەپەستۆکان و پاڵ پێوەنەرەکانی نزم بوونەوە...

بەرەو ژیان و ئامانجی ژیانی ئاژەڵی، هەروەها ڕاست وەستان و لەڕێ لانەدان و ئاوەدانەوە بۆ ئەم لاو ئەولا، وە نەترسان و نەخەڵەتان بە هەڕەشەو بەڵێنی سەفامی، هەوڵ و کۆششێکی یەکجار گەورەیەو بەئارام و بەرگەگرتن نەبی کەس ناتوانێ وەدەستی بێنێ.. ئەو ئارامەی کە ئەوەندە بەلای خوا گرنگ بێت و بەپێویستی بزانی موسڵمانان خۆیان پێی برازێننەوەو لە قورئانی پیرۆزدا ناوی بێنێت..

جا لە بەرامبەر ئەو دۆزەخەدا کە خواناسان لەکاتی شەونوێژیەکەیاندا لەخوا دەپاڕانەوە تا لایان بدات لێیو لەسزای سەختی بیانپارێزێ -چونکە خراپترین شوێن و مەنزڵ و نیشتەجێ بوونە- خوای پەروەردگار بەڵێنیان ئەداتێ پاداشتیان بە بەهەشتەکەی بداتەوە، ئیدی کە چوونە ئەو بەهەشتە ڕازاوەیە بەویستی خوا نەبێ تێیدا نایەنە دەرەوە، وە لە چاکترین شێوەو دامەزران و نیشتەجێ بووندا ژیان دەبەنە سەر.

* سەرنجێک:

بۆمان دەرکەوت کە داواکردنی پێشەوایەتی (**الامامة**) یەکێکە لە نیشانەکانی خواناسان و (عباد الرحمن) بۆیە خوای گەورە دەفەرموێ: خواناسان کەسانێکن کە دەڵێن: ﴿...**واجعلنا للمتقين اماماً**﴾ خوایە بمانکەیتە پێشەنگ و پێشەوای لەخواترسان، دیارە خواناسانی ڕاستەقینە بەکەم ڕازی نابن بۆیە کە داوای پێشەوایەتی دەکەن ناڵێن: خوایە بمانکەیە پێشەوای موسڵمانان و بڕواداران بەڵکو دەڵێن خوایە بمانکەیە پێشەواو ئیمامی خواناسان و لەخواترسان.

بەڵام با ئەوەشمان لەبیر نەچێت کە دوعا پێویستە بەکردەوە بەهێز بکرێت و هۆکارە سەرەکیەکانی وەدەست کەوتنی پێشەوایەتی بەکار بهێنرێن، چونکە ڕەوا نیە تۆ لە کڕنوش (**سجدة**) بردندا بڵێی ﴿**واجعلنا للمتقين اماماً**﴾ بەڵام بەکردەوەش هەوڵی بۆ نەدەی یان کە موسڵمانان پێویستیان بەتۆ بوو بڵێی: بەخوا کاکە من بەکەڵکی هیچ نایەم و من توانای بەڕێوەبردن و سەرپەرشتی کردنی هیچ کارێکم نیە!!

وە هەروەها ئەم ئایەتە ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە پێویستە موسڵمانان وە خواناسان هەوڵ بدەن بۆ پێشەوایەتی کردنی خواناسان نەک وەکو هەندێ موسڵمانان وا تێ گەیشتوون کە داواکردنی پێشەوایەتی کارێکی ڕەوا نیە بە بەڵگەی فەرموودەی پێغەمبەرﷺ کە دەفەرموێ: (**انا لا نولي هذا الأمر من طلب**).

واتە/ ئێمە کاری پێشەوایەتیو فەرمانڕەوایەتی نادەینە دەستی کەسانێک کە خۆیان داوای دەکەن.

بەڵام با ئەوەمان لەبیر نەچێت کە ئەم فەرموودە باس لە پێشەوایەتی دونیایی دەکات نەک دینی ئەگینا خوای گەورە وەکو نیعمەتێکی خۆی بەسەر گەلی موسادا دەفەرموێ: ﴿**وجعلنا**

منهم أئمة يهدون بأمرنا لما صبروا وكانوا بآياتنا يوقنون﴾[٣٠٧]

واته/ چەند پێشەوامان لەو گەلەدا دروست کرد کە خەڵکیان شارەزا دەکرد لەسەر فەرمانی ئێمە، لەبەر ئەوەی کە ئارام و خۆگر بوون لەبەر باری ئازاری دوژمنانداو خۆگربوون بەرامبەر بەنەزان و سەرسەختانی بەنی ئیسرائیل توانیان تەورات بگەیەننە مێشکی وشکی ئەو کۆمەڵە ئادەمیزادە وە ئەو پێشەوایانە لەگیانی خۆیاندا باوەڕو متمانەی تەواویان بە ئایەتەکانی ئێمە هەبوو.

هەر بۆیەش (سوفیان) دەفەرموێ: (**بالصبر واليقين تنال الامامة في الدين**).

واته/ بەئارام و خۆگریو یەقین و متمانەی تەواوەوە مرۆڤ دەگاتە پلەی پێشەوایەتی لە دیندا.

کەواتە موسڵمانان و بەندە چاکەکان پێویستە هەوڵ بدەن ببنە پێشەواو ئیمام بۆ خواناس و لەخواترسان ئنجا پێشەوایەتی کردنی کاروانی خواناسیش بەوە وەدی دێت، کە ئەو سیفاتانەی خوای گەورە باسی کردوون لە سوورەتی (الفرقان)داو کردوونیە مەرجی سەرەکی بۆ بەندە ڕاستە خواناسەکان و سەرەتاکەی دەست پێ دەکات بە ﴿**وعباد الرحمن الذين يمشون على الارض هوناً واذا خاطبهم الجاهلون قالوا سلاماً**...﴾ وە کۆتایشی دێت بە ﴿**والذين يقولون ربنا هب لنا.... واجعلنا للمتقين اماماً**...﴾. چونکە کاتێک دەبیە پێشەواو ئیمام کە خاوەنی ئەو سیفاتانە بیو کاتێکیش بۆت هەیە داوای پێشەوایەتی بکەی کە ئەو سیفاتانەت تێدا ئامادەبن.

---

٣٠٧ سجدة ٢٤

# وانەی نۆیەم:

## ﴿ولا تهنوا ولا تحزنوا وانتم الاعلون إن كنتم مؤمنين﴾

**آل عمران/١٣٩**

واتە/ مەترسن و بێ تاقەت مەبن و نارەحەت مەبن لە جیهادو لاوازیتان پێوە دیار نەبێ، غەم و پەژارە داتان نەگرێ.. هەر ئێوە بەرزو پایە بڵندو سەرکەوتوون ئەگەر ئێوە بڕواداری ڕاستەقینەبن.

ئەگەر بمانەوێ لە باوەشی تاقی کردنەوەکانی ئەم ئایەتە وەکە گڕی لێ دەباریٚ ئاسەی دووری دڵ بشکێنین و لە سەنگەرەکەیەوە بۆنی تەپ و تۆزی ئەو مەیدانە بکەین کە ئەم بەسەریاندا دەڕوانێت ئەوە لەوانەیە هەندێک لە تەم و مژی ڕێگای سەرکەوتنی هەردوو ژیانمان بۆ ڕوون بکاتەوە... ئەو کەسانەش کە لەناو دڵی ئەم ئایەتە گەورە دەبن و تاجی وڵاتی ئایەتەکە لەسەر دەنێن.. گەر بەخۆشەویستی ئەو نەسوتێن پیرۆزی خۆیان ون دەکەن و پەپولەی گیانە شیرینەکەیان دەمرێت.. جا بۆ خەڵکی ئەم وڵاتە... بۆ ئەوانەی لە خۆشەویستی ئەم ئایەتەدا بەختیارییان دیاری دەکەن.. ئەم تیشکانەی کە هەر لەوێوە هاتوون و لەنێو دڵمدا گەڵاڵە بوون پێشکەش دەکەم...

١- وەک دەزانین ئەم ئایەتە جەنگی (احد) هێنایە خوارەوە بۆ سەر زەوی لەو کاتەدا بوو کۆشکی کۆماری ئەم وڵاتە سەربەخۆیە دامەزرا... تاوەکو لەنێو دەشت و قەدپاڵی شاخ و گردو تەپەکانیدا ئازارو ئێشی موسڵمانانی تێک شکاوی (احد) بکەن بە گوڵاڵە سورەو دڵی شکاویانی پێ ئاشت بکاتەوە...

٢- هەر ئەم ئایەتە بوو بانگی ئەو کێشە ڕاستیەیدا کە سەرکەوتن و شکاندن دوو قۆناغن کۆمەڵی موسڵمانان دەبێت بۆ گەیشتنە چڵەپۆپەی دەسەڵات بیبڕن.

٣- لەم ئایەتەدا هەروەکو لەو سەردەمەدا باوە شێنی دڵی ئەوانەی کرد، ئێستاش دەبێتە زەریایەکی ئارام کڵپەو بڵێسەی ئەو دەروونانە خامۆش دەکات، کە بۆ خوا سوتاون و چاوەڕێی هێنانەوەی ئیشتمانی گەورەی ئیسلامن.

٤- ئەم ئایەتە پێمان دەڵێت: موسڵمان هەرگیز نابێت دەست بەرداری تەمەنی کورتی چرۆ بێت بۆیە ئەو کەسەی وزەو توانای خۆی زیندەبەچاڵ دەکات خێرا دەدۆڕێت و مرۆڤی بێ هیواش لە مردوو بێ گیان ترە..

٥- هەر کاتێک کۆمەڵی موسڵمانان لەهەر پارچە خاکێکی ئەم گیانی زەوی یەدا جیهادیان کردو سەرنەکەوتن ئەوە بزانن ئایەتەکە سەلماندوویەتی کە هەڵە لە دانانی هەنگاوەکانیدا بەرەو ئەو ئاواتە مەزنە دروست بووە، بۆیە دەبێت خێرا گەشتێک بکەنەوە بە خۆیانداو هەڵەکانیان چارەسەر بکەن.

٦- باوەڕی لە پۆڵا بەهێزتری موسڵمانان وەکو چیا دامەزراوەو خۆی ڕاگرتووە.. دەسا با ئەوانەی بە خەیاڵی هەرەسی ئەو چیایەوە رۆژگار دەکەن بە قوربانی شەوگار ئاگاداربن کە پێنج دوو رۆژەکەی دونیایان لەدەست دەچێت و بەئاواتی خۆیان ناگەن چونکە ئێمە ﴿**ولا تهنوا ولا تحزنوا وأنتم الأعلون**﴾مان هەیەو ئەوانیش: تاپول و ڕووخاوو پەشێوێکن نەخۆیان دەدۆزنەوەو نەئەو ئامانجەی کە بۆی دەژین کەواتە قوڕ بەسەر کێ؟؟؟.

# وانەی دەیەم:

## ﴿يا أيها الذين آمنوا إن تنصروا الله ينصركم ويثبت أقدامكم﴾ محمد/٧

واتە/ (ئەی کۆمەڵی باوەڕداران گەر خوا سەر بخەن خوا پشت گیریو کۆمەکیتان لێ دەکات، پێتان جێگیرو دامەزراو دەکات)

خوای گەورە موسڵمانان بێدار دەکاتەوە لە هۆو مەرجەکانی سەرکەوتن، مافەکانی سەر شانی بەندەکانی دیاری دەکات و سەرەنجامی ئەم کاروانەش دەست نیشان دەکات گەر بەندەکانی هەستن بە ئەرکی سەر شانی خۆیان.

* مافی خوای گەورەیە داوا لە بەندەکانی بکات دڵ و دەروونیان پاک و خاوێن بکەن لە هەموو تاوان و خراپەیەک، بیرو هۆشیان بەدوور بێت لە هەموو جۆرەکانی هاوبەش پەیداکردن (شرک)ی نهێنیو ئاشکرا، ئەمەش سەرخستنی خوایە لە دەروون و فیکردا.

* مافی خوای گەورەیە داوا لە بەندەکانی بکات تەنها ئیسلام بکەنە رێبازو یاسای ژیان وە جگە لە قورئان بەهیچ دەستوورو رێسایەک رازی نەبن، وە هەوڵ بدەن لە هەموو بوارەکانی ژیاندا ئیسلام بچەسپێنن، ئەمەش سەرخستنی خوایەلە عەقیدەو واقیعدا.

* مافی خوای گەورەیە داوا لە باوەڕداران بکات کە هەوڵ و تێکۆشانیان هەبێت بۆ سەرخستنی دینی خواو تەنها مەبەستیشیان ڕەزامەندی پەروەردگاریان بێت کە ئەمەش سەرخستنی خوایە لە چەسپاندنی بانگی خواو گەیاندنی بە مرۆڤایەتی... لەگەڵ ئەمانەشدا زۆر جار موسڵمانان هەموو مافەکانی خوا جێ بەجێ دەکەن و مەرجەکانی سەرکەوتن بەدی دەهێنن بەڵام سەرکەوتن دوا دەکەوێت و ئامانجەکانیان لی بەدوور دەبێت و سەرفراز نابن لە کاروانەکەیاندا. ئەمەش زۆر جار لە مێژووی ئیسلامدا دووبارە بۆتەوە بەڵام ئەوەی جێگەی گومان نییە هەر کارێک پەروەردگار بریاری لەسەر بدات و نەخشەی بۆ کێشا بێت بێ حیکمەت و مەبەست نییە.

* هەندێ جار یارمەتی خوا دوا دەکەوێت بۆ موسڵمانان ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە گەورەیی‌و دەسەڵاتی خوا ئاشکرا دەبێت پاش ئەوەی کۆمەڵی بڕواداران هەموو وزەو توانایان دەخەنە کار بۆیان دەسەلمێت کە یارمەتی خوا نەبێت ناتوانن سەر بکەون و توانای ڕوو بەڕوو بوونەوەیان نابێت.

* هەندێ جار سەرکەوتنی خوایی بۆ موسڵمانان دوا دەکەوێت چونکە موسڵمانان بەتەواوی‌و بەیەکجاری خۆیان یەک لایی نەکردۆتەوەو بەتەواوی بۆ خوا کاریان نەکردووە، چونکە یەکێک لەهۆیە سەرەکی‌یەکانی سەرکەوتن دڵسۆزی‌یە (**اخلاص**)ە بۆ ڕێگەی خوا.

* یان هەندێک جار یارمەتی خوا بۆ موسڵمانان دوا دەکەوێت ئەمەش بۆ ئەوەیە موسڵمانان زیاتر خۆیان نزیک بکەنەوە لە پەروەردگار و زۆرتر بەندایەتی‌و خۆشەویستی بنوێنن چونکە هەمیشە لەکاتی نەبوونیدا زۆرتر پەروەردگارمان لەیاد دەبێت و زۆرتر لەگەڵی دەژین.

* زۆر جار سەرکەوتن دوا دەکەوێت چونکە زاڵمان و خراپەکاران بەتەواوی نەناسراون لە لایەن چینە جیاوازەکانی کۆمەڵەوە.

* هەندێ جار کۆمەکی‌و پشت گیری خوا دوا دەکەوێت ئەمەش بۆ ئەوەیە موسڵمانان بەگران و ناڕەحەتی بگەنە ئامانجەکانیان تا بە ئاسانی‌و سادەیی لە دەستی سەدەن، ئەوەی بە خوێن کڕابێت بە خوێنیش دەفرۆشێتەوە.

* هەندێک جار یارمەتی خوا دانابەزێتە سەر موسڵمانان چونکە لەناو ڕیزی بڕوادارانـدا دووڕوو (منافق)و دڵ نەخۆش هەن کە لە پاشەڕۆژدا دەبە بەربەست لە ڕێی چەسپاندنی ئیسلامدا و تاقی کردنەوەش بۆتەی باوەڕەو هەموو کەسێکیش لەژێر تاقی کردنەوەدایە.

* یاخود زۆر جار یارمەتی خوا ون دەبێت چونکە کۆمەڵی موسڵمانان کەم و کورتی‌و ناتەواویان هەیەو ئامادە نین فەرماندەیی‌و مامۆستایی کۆمەڵێک بەڕێوەبەرن.

* یان زۆر جار یارمەتی خوا دوا دەکەوێت لەبەر یەکلانەبوونەوەی موسڵمانان و خۆپاک نەکردنەوەیان لە تیرە پەرستی‌و ڕەگەزپەرستی‌و نەتەوە پەرستی‌و خۆپەرستی... چونکە خوای گەورە کۆمەڵێکی نەخۆش ناکاتە فەرماندەو چاوساغی جەماوەرێک.

* لەهەمان کاتدا خوای گەورە لەم ئایەتەدا سروشتی ئەم ژیانەمان بۆ دەست نیشان دەکات کە هیچ شتێک بەبێ ماندووبوون نایەتە دی‌و هەموو ئامانجێک شەونخونی‌و

چەرمەسەری دەوێت و گشت هەنگاوێک ئامادەیی و قوربانی دانی دەوێت: ﴿ولقد خلقنا الانسان في كبد﴾[308]

* هەروەها لەم ئایەتەدا سەرنج دەدەین خوای گەورە پاش سەرکەوتن پەیمانی جێگیربوون و دامەزراندنی داوە: ﴿ينصركم ويثبت أقدامكم﴾ ئەمەش تاقی کردنەوەیەکی دیکەی خواییمان بۆ ڕوون دەکاتەوە، زۆر هەن بە ئارامن لەکاتی کێشەو ناخۆشیدا، خۆگرن بەرامبەر هەموو شالاوێک، بەڵام لەکاتی سەرکەوتن و سەرفرازیدا لەکاتی گەیشتنە ئامانجیان هەموو سنوورو پەیمانێکیان لەیاد دەچێت، مەبەست و کاری سەرەکیان لەبیر دەچێت بەمەش پاداشتی سەرکەوتنیان لەدەست دەچێت.

# * یاساکانی سەرکەوتن (نصر) لە قورئانی پیرۆزدا:

بێ گومان سەرکەوتن چەند یاساو ڕێسایەکی هەیە کە خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا تۆماری کردوون تا بەندە بڕوادارەکان ئاشنا بن پێیان و لەسەر چاوساغی و چاوڕۆشنی (بصيرة) هەڵس و کەوتیان لەگەڵدا بکەن کە بەکورتی بریتین لەم یاسایانەی خوارەوە:

* **یاسای یەکەم:** سەرکەوتن (نصر) لە لایەن خوای گەورەوەیە ئنجا هەر کەسێک خوا سەری خست بەهیچ جۆر کەس بەسەریدا زاڵ نابێت، هەر چەندە هەموو دەوروبەری دژی ڕاوەستن وە هەر کەسێکیش خوا زەلیل و ریسواو تێکشکاوی کرد ئەوە بێ گومان کەس ناتوانێ سەری بخات هەر چەندە ڕێژەیەکی زۆر گەورەش سەربازو عتاد (العدد والعدة)ی لەگەڵدا بێت.

ئەم یاسایەش زۆر بە ڕوونی خوای گەورە بڕیویەتیەوە لە قورئانی پیرۆزدا بەبێ دوو دڵی هەروەک دەفەرموێ: ﴿ان ينصركم الله فلا غالب لكم وإن يخذلكم فمن ذا الذي ينصركم من بعده وعلى الله فليتوكل المؤمنون﴾[309]

بێ گومان زۆر جاران خوای گەورە کۆمەڵێکی کەم سەر دەخات بەسەر کۆمەڵێکی ڕێژە

---

[308] البلد

[309] آل عمران ١٦٠

زۆردا هەروەکو **طالوت** و هاوڕێیەکانی بەو کەمیەیانەوە سەرخست بەسەر جالوت و پێرەکەی لەگەڵ ئەو هەموو سوپا زۆرەی کە هەی بوو لەگەڵ ئەوەشدا هەر لەناو هاوڕێیانی **طالوتدا** کەسانی وا هەبوون کە کاتێک چاویان بەو هەموو هێزو سوپا زۆرەی جالوت کەوت وتیان: ﴿**لا طاقة لنا اليوم بجالوت وجنوده، قال الذين يظنون انهم ملاقوا الله كم من فئة قليلة غلبت فئة كثيرة بأذن الله والله مع الصابرين**﴾[310]

وە زۆر جاران خوای گەورە سەرکەوتنی خۆی دەدا بە کەسێک کە ئەسوپاو سەربازی هەیەو ئەچەک و جبەخانەشی هەیە بەهیچ شێوەیەک، هەروەکو پێغەمبەرﷺی سەرخست بەسەر موشریکەکانی قورەیش لە کاتێکدا کە خۆی بەتەنیا لەگەڵ ئەبوبەکردا -خوا لێی رازی بێ- لە ئەشکەوتەکە دابوون و قورەیشیەکانیش گەیشتبوونە سەریان ﴿**إلاّ تنصروه فقد نصره الله اذ أخرجه الذين كفروا ثاني اثنين اذ هما في الغار اذ يقول لصاحله لا تحزن ان الله معنا...**﴾[311]

*** یاسای دووەم:** بێ گومان خوای گەورە سەرکەوتن نابەخشێت بەو کەسە نەبێت کە خوا سەر بخا، ئنجا کەسێک خوا سەر بخات خواش سەری دەخات چونکە ئەمە یاسایەکە کە خوا لە قورئاندا بە **صيغەی** مەرج و پاداشت (**الشرط والجزاء**) هێناویەتی: ﴿**يا أيها الذين آمنوا إن تنصروا الله ينصركم ويثبت أقدامكم**﴾[312]

وە هەروەها لەسەر شێوەی (**الخير الثابت المؤكد بلام القسم ونون التوكيد**)یش هاتووە: ﴿**ولينصرن الله من ينصره ان الله لقوي عزيز**﴾[313]

ئنجا سەرخستنی خواش وەدی دێت بەسەرخستنی دینەکەیو بەرزکردنەوەی دروشمی ئیسلام و ئاڵاکەیو چەسپاندنی یاساو شەریعەتی خوا لەناو خەڵکیدا هەر بۆیە خوای گەورە دوا بەدوای باس کردنی لەو کەسانە خوا سەر دەخەن دەفەرموێ: ﴿**الذين؟ ان مكناهم في الأرض أقاموا الصلاة وآتوا الزكاة وأمروا بالمعروف ونهوا عن المنكر و لله عاقبة الأمور**﴾[314]

---

[310] البقرة/ ٢٤٩
[311] التوبة ٤
[312] محمد ٧
[313] حج
[314] حج ٤

وە زۆر جاران قورئانی پیرۆز سەرخستنی خوا دەبەستێتەوە بە بیرو باوەڕو ئیمانەوە یـان بـە سەربازی (**الجندية**)ە بوونەوە بۆ خوا، ئنجا هەر کەسێک بە چاکـترین شـێوە بـڕوا بێنـێ بـەخوا ئەمە بێ گومان سەری دەخات و دەبێتە سەربازێک لە سوپاو جەیشی خـوای گـەورە، هـەروەکو خوا دەفەرموێت: ﴿**وكان حقاً علينا نصر المؤمنين**﴾[٣١٥]

* **یاسای سـێ یـەم:** بـێ گومـان هـەروەکو سـەرکەوتن نـابێت تـەنها بـۆ بڕوادارانـی ڕاستەقینە نەبێت هەروەها ناشبێت بەبێ بڕوادار، چونکە سـەرکەوتنەکە بـۆ ئەوانـەو بەئەوانـە، ئەوان تونێشوو مەبەستی سەرکەوتنن هەروەکو خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿**هـو الـذي أيـدك بنصره وبالمؤمنين والف بين قلوبهم**﴾[٣١٦]

* زۆر جاران خوای گەورە دابەزاندنی فریشـتەکانی لـە ئاسمانـەوە بـۆ سـەر زەوی دەکاتـە هۆیەک بۆ سەرخستنی کەسێک کە بیەوێ هەروەکو لە جـەنگی (بـدر-خنـدق-حنـين- ڕوویدا وەکو دەفەرموێ: ﴿**اذ يوحي ربك الى الملائكة اني معكم فثبتوا الذين آمنوا**﴾[٣١٧]

* وە زۆر جاران خوای گەورە دیاردە سروشتی‌یەکان (**الظواهر الطبيعية**) ژێربـار دەخـات و دەیانکاتە هۆیەکی سەرکەوتن بۆ کەسێک کە بیەوێ سەری بخـات یـان دیـاردە سروشـتی‌یەکان زاڵ دەکات بەسەر ئەو کەسەی کە دەیەوێ تێکی بشکێنێ، هەروەکو خوای گـەورە بـا (ريح)ی زاڵ کردو کردی بەهۆیەک بۆ تێکشکانی موشریکەکان لە جەنگی (خندق)دا: ﴿**فأرسلنا عليهـم ريحاً**﴾[٣١٨]

وە هەروەها بارانی ڕەحمەتیشی باراندە سەر موسڵمانان لە (بدر)دا: ﴿**وينزل عليكـم مـاءً ليطهركم به ويذهب عنكم رجز الشيطان وليربط على قلوبكم ويثبت به الاقدام**﴾[٣١٩]

* وە زۆر جاران خوای گەورە کەبیەوێت کەسێک سـەر بخـات، سـەری دەخـات بەدەسـتی خۆیو دوژمنانی خوا -واتە بۆ خۆیان دەبنە هۆی تێکشـکانیان- بـەوەی خـوای گـەورە تـرس و بیمێکی زۆر دەخاتە ناو دڵیانەوە کە ئەم ترسە مەعنەویاتیان ناهێڵێ لە کاتێکدا کـە بنـەمای

---

الروم،٧

لانفال ٦٢-٦٣

لانفال،١٢

لاحزاب ٩

لانفال ١١

سەرەكى بەرگرى كردن و هێرش بردن، مەعنەويات بەرزى يە!!

وە هەروەها كەسايەتيە ديارەكانيشيان دەكوژرێن: هەروەكو ئەم كارە ڕووىدا لە جولەكەكانى (بنو نضير):

﴿هو الذي أخرج الذين كفروا من أهل الكتاب من ديارهم لأول الحشر ما ظننتم أن يخرجوا، وظنوا أنهم مانعتهم حصونهم من الله فأتاهم الله من حيث لم يحتسبوا وقذف في قلوبهم الرعب يخربون بيوتهم بأيديهم وأيدي المؤمنين فاعتبروا يا أولي الأبصار﴾[٣٢٠]

بەڵام با ئەوەشمان لەبير نەچێت كە هەموو هۆكارو كەرەستەكانى سەركەوتن و زاڵ بوون پابەندن و وەستاون لەسەر بوونى گەورەترين هۆكارو ئامێر كە بريتىيە لە بووى بڕواداران.

بڕواداران+كۆمەڵ بوون و يەكڕيزى+سەرخستنى بەرنامەى خوا= بەسەركەوتن و زاڵ بوون.

# * بنەما سەرەكيەكانى سەركەوتن (( عوامل النصر الحقيقية )):

١- سەقامگيرىو نەڕووخان لەكاتى ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ دوژمندا.

٢- پەيوەندى هەميشەيى بەخواى گەورەوە بە پاڕانەوەو يادكردنىو خۆپاراستن لە فێڵ و تەڵەكەى شەيتان.

٣- گوێ ڕايەڵى كردنى خواو پێغەمبەر لە هەموو كارو بارەكانى ژياندا.

٤- خۆ دوور خستنەوە لە كێشە (نزاع)و دوو بەرەكىو پەرتەوازەيىو دابڕدابڕىو هەڵەشەيى.

٥- خۆڕاگرىو ئارامگرتن لەسەر هەموو ئەركەكانى ڕووبەڕووبوونەوەو ململانێى نێوان حەق و باطلدا.

٦- دڵسۆزىو يەكلابوونەوە بۆ خواى گەورە: هەروەكو خواى گەورە دەفەرموێ: ﴿يا أيها الذين آمنوا اذا لقيتم فئة فاثبتوا واذكروا الله كثيراً لعلكم تفلحون، واطيعوا الله ورسوله

---

حشر ٢

ولا تنازعوا فتفشــلوا وتذهـب ريحكـم واصـبروا ان الله مـع الصـابرين﴾[٣٢١] ﴿ولا تكونـوا كالذين خرجوا من ديارهم بطراً ورئـاء النـاس ويصـدون عـن سـبيل الله والله بمـا يعملـون محيط﴾[٣٢٢]

---

[٣٢١] الانفال/٤٥-٤٦

[٣٢٢] الانفال/٤٧

من كتاب طريق الدعوة في ظلال القرآن ص٣٥٢-٣٥٣

# وانەی یەکەم:

عن ابن عباس (رض) عن النبي ﷺ قال:

## (...ومن استمع الى حديث قوم وهم له كارهون صبّ في اذنيه الآنك يوم القيامة)[٣٢٣]

واتە/ عەبدوللای کوڕی عباس (رەزای خوای لێ بێت) لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی (...هەروەها هەر کەسێک گوێ شل بکات بۆ قسەی کۆمەڵێک و ئەوان پێیان ناخۆش بێت و رازی نەبن، ئەوە لە قیامەتدا قوڕقوشمی تواوە دەکرێت بەهەردوو گوێیدا

**بوارەکانی هەواڵ دزین:** جێگەی باسە ئەم کاری هەواڵ دزینە (سیخوڕی- تجسس) دوو بواری هەیە:

١- هەواڵ دزین لە دوژمنانی دین.

٢- هەواڵ دزین لە ئەهلی دین.

بۆ یەکەمیان سەک هەر دروستەو فەرموودەکەی باس لەمە ناکات، بەڵکو واجبیشەو موسڵمان بە هەموو شێوەیەک دەزگای گوێ گرتن (**أجهزة الانصات**) لەسەر دوژمنان دابنێت و لەناویاندا بڵند گوێی خۆی دروست بکات پێغەمبەری خوا ﷺ لە شەڕی (ئەحزاب)دا فەرمووی:

**((الا رجل يأتيني بخبر القوم جعله الله معي يوم القيامة))**[٣٢٤]

واتە/ هەرکەس هەواڵی دوژمنم بۆ بهێنێ دەیکەمە هاوڕێی خۆم لە بەهەشتدا!

لە هەندێ ریوایەتدا هاتووە پێغەمبەر ﷺ عەباسی مامی خۆی (باوکی عبدوللا)ی لە مەکە دانابوو، بۆ ئەوەی هەموو هەواڵێکی قورەیشی بۆ بنێنیت. چاودێری کردنی دوژمنان بە چاودێری کردنی ژمارەیان، چەک و جبەخانەیان... تابورەکانیان... ئوسلوب و شێوازی

---

[٣٢٣] [illegible]

[٣٢٤] [illegible]

کارکردییان.. توانای دارایی یان دەبێت... هتد.

بۆ دووەمییان... دیارە ئەک هەر دروست نییە، بەڵکو گەورەترین تاوانە دەرهەق ئەهلی دین بکرێت، چونکە سوەدی موسڵمانان پڕ لە کینەو دڵپیسی دەکات، لە یەکیان بەدبین و بەدگومان دەکات.

**﴿ان الذين يحبون ان تشيع الفاحشة في الذين آمنوا لهم عذاب اليم في الدنيا والآخرة. واللّٰه يعلم وأنتم لا تعلمون﴾**[٣٢٥]

ئایەت و فەرموودە زۆرەکانیش دەربارەی حەرام کردنی (سیخوڕی کردن) مەبەستیان ئەم لایەنەیە.

هۆی ئەم فەرموودەیە: پێغەمبەری خواﷺ لەبەر ئەوەی خوا ئاگاداری دەکاتەوە، دەزانێت ئەو جۆرە ڕەوشتانە چ زەرەرێک لە کۆمەڵگە بەشەریەکان دەدات بۆیە خێرا ئاگادارمان دەکاتەوەو عاقیبەتی سنوور شکاندنەکەمان دەداتە دەست...

بەپشت گوێ خستنی ئەم فەرموودەیە دوو زەرەر ڕوو دەدات زەرەرێک لە دونیادا، کە دەبێتە هۆی دروست کردنی دڵ پیسیو دەمەقاڵەو لێکدابڕان و زۆرجاریش شەڕو هەراو کوشت و کوشتارەوە. زەرەرێک لە قیامەتدا کە فەرموودەکە باسی دەکات...

با پێغەمبەرﷺ بکەینە مامۆستای بەهەقی خۆمان و ئەکەین ڕێگە بەنەفسمان بدەین (نزوڵی) بکات و، سواری ئەسپی شەیتان بێت و لەکەنارێکدا هەڵمان بداتە خوارەوە... **﴿يا أيها الذين آمنوا اجتنبوا كثيراً من الظن ان بعض الظن اثم ولا تجسسوا ولا يغتب بعضكم بعضاً...﴾**[٣٢٦] جا حەز دەکەین لەسەر یەک دوو بڕگەی فەرموودەکە هەڵوێستە بکەین:

قسەی خەڵک ((**حديث قوم**)): دیارە هەموو کەسێک خاوەنی هەڵەو کەم و کوڕی یەو شتی ناقۆڵاش دێت بەدەمیداو شەیتان غافڵ گیری دەکات و پەندی زۆری پێدا دەدات.. جا مادام وایە.. خەڵک قسەی زۆری هەیە کە بەرژەوەندی لەوە دایە کەس گوێی لی نەبێت و نەیبێت.

گوێ گرتن: ئەم گوێ گرتنەش دوو جۆرە، یان ئەوەتا کۆڕێکەو کەسیان ڕوویان نییە بەو

---

٣٢٥ سـ د

٣٢٦ حجر ـ ٢

شەخسە بڵێن: کاکە بەیارمەتی خۆت ئێمە هەندێ قسەی تایبەتی خۆمان هەیە، بۆیە مەجبور دەبن دەست بەقسان بکەن و زۆر پێشیان ناخۆشە فلانە کەس گوێی لێ بێت، یان ئەوەیە، ئەو فلانە کەسە بە دزیەوە بەبێ ئاگای ئەمان سیخوڕی دەکات و هەواڵیان لێ دەدزێت! یان ئەوەیە سوود لە شێوازی تر وەردەگرێت وەک (دواندنی منداڵی ماڵ یان کەسانی تر) بۆ دەرهێنانی قسە لێیان! کە فەرموودەکە پشتگیری جۆری دووەمیان زیاتر دەکا!، هەڵوێستی ئەو موسڵمانەم هەرگیز لەیاد ناچێت کە لە ماڵەکەیدا میوان بووین و پاش نوێژی بەیانی خاوەن ماڵەکە خۆی بەژێر جێگەکەیدا کردو لێی پاڵ کەوت، من و برادەرەکەی خۆشم دەستمان کردە قسەی خۆمان، کە خاوەن ماڵەکە دەزانێت ئێمە سەربەستی خۆمان وەرگرتوە لە قسەکردندا چونکە ئیمانمان وایە کە ئەو خەوتوە، ئیحراجی ڕووی تێ دەکات و نازانێت چی بکات، مەجبورە هەر لەژێر لێفەکەیدا هەردوو دەستی دەکات بە گوێچکەیدا خۆی لێ مت دەکات، بێ ئەوەی تاکە قسەیەکیش چیە نەیبیسێت لێمان! بەیانی کاتی خوا حافیزی بە برادەرەکەمی گوتبوو: گەردنی ئازاد بکەین لەبەر ئیحراجی نەیتوانی بوو ماڵەوە بەجێ بهێڵێت.

بەهەر حاڵ موسڵمان پێویستە زۆر بەهۆش بێت و خۆی لەم تاوانە گەورەیە بپارێزێت و لە هەردوو حاڵەتەکەدا خۆی بە فاکتەری ئیمان پاشەکشە لەو گوێ قوڵاغ بوونە بکات و تۆبە بکات.

# وانەی دووەم:

**قال الرسول ﷺ:**

## (كل معروف صدقة ومن المعروف ان تلقى أخاك بوجه طلق، وان تفرغ من دلوك في أنائه)[٣٢٧].

واتە/ هەموو جوان و دان پێدانراوێک خێرو چاکەیە. لە کارە جوانەکانی دەژمێردرێت، ئەگەر بەڕوویەکی خۆشەوە بگەیە براکانت و هەروەها ئاوی دوڵەکەت لە دەفرەکەیدا خاڵی بکەیتەوە.

موسڵمانی بەڕێز ئەگەر بە وردی سەرنجی ئەم فەرموودەیە بدەین ئەم خاڵانەی خوارەوە دێت بەیادماندا:

١- خوای گەورە بەبەزەییەیە فراوانەکەی بواری چاکەو خێری زۆر فراوان کردووە بەشێوەیەک هەر کەسێک بیەوێت توانای توێشوو پڕکردنی هەبێت و کەس بێوەیو دڵ شکاو نەبێت.

٢- مرۆڤی موسڵمان نابێ هیچ کارێکی جوان بەکەم بزانێت، چونکە بەخێرو چاکە دەنوسرێت و لە رۆژێکدا فریای دەکەوێت نەماڵ و نەسامان و نەکەس و کار فریای ناکەون پێغەمبەریش ﷺ لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرموێت: ((لا تحقرن من المعروف شيئاً ولو ان تلقى أخاك بوجه طلق))[٣٢٨]

٣- هەرکاری بچوک بچوکە بەردەوام بوون لەسەری زۆرو گەورەی دەکات.

**لا تحقرن صغيرة ان الجبال من الحصى**

واتە/ هیچ شتێکی بچووک بەکەم مەزانە، چونکە شاخ و کێوەکان پێک هاتووە لە وردە بەرد.

٤- رووی خۆش شوێنەواری زۆر گەورە جێ دەهێڵێت بۆیە ئەوەندە گرنگ باس کراوە، لەو

---

رواه احمد والترمذي وصححه.

رواه مسلم

شوێنەوارانە:

أ- ڕێگەبڕین لە شەیتان بۆ دروست کردنی گومانی خراپ و کینەو لێک دابڕانیو بۆیەک نەسوتان.

ب- دروست کردنی دڵ پاکیو بۆیەک بوون. پیرەمێرد دەڵێت:

نابێ دوژمنی خۆت بەکەم بگری

دەرزی خوێنی لەش بەردا پێی دەمری.

ج- بەجێ هێنانی سوننەتێکەو شوێنەواری پڕ خێرو زۆر بەجێ دێڵێ:

بە پێچەوانەی ئەوەوە، شوێنەواری شومی زۆر دروست دەبێت، ئەگەر تەرکی سونەتێکی پێغەمبەرﷺ بکرێت، (ئەورەسی) بەڕەحمەت بێت دەڵێت: تەرکی سوننەیەکی ئەبەوی خەلەلێکی کەونی بەدوادا دێت.

٥- لە فەرموودەکەدا دوو نموونە هێنراوەتەوە لە کارە جوانەکان کە ڕووگەشیو یارمەتی دانی یەکترە لە کاردا، با ئەو کارە کەمەش خاڵی کردنەوەی دۆڵچەکەت بێت لە دەفرێکی هاوەڵەکەتدا، ئەمە سەرنجمان ڕادەکێشێت کە بۆ یەک بوون بە یارمەتی دان دروست دەبێت و هەمیشە لەگەڵ یەکتردا لەسەر خێرو چاکە بژین، بۆ ئەوەی ڕێگەی دوژمن ببڕین لەلەت و پەت کردنی موسڵمانان. ﴿**قل لعبادي يقولوا التي هي أحسن ان الشيطان ينزغ بينهم ان الشيطان كان للانسان عدواً مبيناً**﴾[٣٢٩]

واتە/ بڵێ بە عەبدەکانم با زۆر باش بڵێن چونکە شەیتان وەسوەسەو لەخێرترازانیان بۆ دروست دەکات، بەڕاستی شەیتان دوژمنێکی ئاشکرای ئادەمیزادە.

٦- ئەم فەرموودە شیرینە وا لە مرۆڤ دەکات هەمیشە ئاگادار بێت و هەر کارێکی کرد دەبێت نیازی خێرو چاکەی لێ بێنێ، چونکە نیەتی چاک و هەڵس و کەوت و قسەیەک دەگۆڕێت بۆ چاکە وەک قاعیدەیەکی شەرعی دەفەرموێت: ((**النية الصالحة تقلب العدة عبادة**)).

٧- لە هەموو ئەو فەرموودانەی تریشدا کە باسی پەیوەندی نێوان تاکەکانی کۆمەڵگەی ئیسلامی دەکات داوا لە موسڵمانان دەکات هەمیشە نەرمیو سۆزو باڵ ڕاخستنیان هەبێت بۆ

---

[٣٢٩] الاسراء ٥٣

یەکترو لە خزمەتی یەکدابن و لە شێوەی پارچەیەکی یەک لاشەبن، بەڵام لەگەڵ بێ باوەڕان و دوژمناندا بە پێچەوانەوە بن، هەرگیز سەرشۆڕیو کەمی نەنوێنن.

دە تۆش ئەی موسڵمانی بەڕێز وەک ئەندامێک لەناو کۆمەڵگەی ئیسلامیدا خۆت بە موسڵمانانەوە ببەستەوەو ببە بەپاڵپشتیان بۆ بڵاو کردنەوەی خێرو چاکەو زیندوو کردنەوەی ڕەوشتە جوانەکان.

لە هەموو کارێکی جوانتدا نیازی خێرت هەبێت، تاوەکو خوای گەورە بەڕەحمی خۆی لەناو بەندە چاکە کارەکاندا تۆمارت دەکات و ئەو کاتە سەرفرازیو ڕزگاری بەدەست دەهێنیت.

# وانەی سێیەم:

عن ثوبان (رضي الله عنه) عن النبيﷺ انه قال:

**يوشك أن تداعى عليكم الأمم من كل أفق، كما تداعى الأكلة على قصعتها قلنا يا رسول الله أمن قلة منا يومئذ؟ قال أنتم يومئذ كثير، ولكنكم غثاء كغثاء السيل، تنزع المهابة من قلوب عدوكم ويجعل في قلوبكم الوهن، قالوا، وما الوهن؟ قال (حب الدنيا وكراهة الموت)[٢٣٠].**

واتە/ ڕۆژانێک بەڕێوەیە کە میللەتانی دنیا لەهەموو لایەکەوە بەسەرتاندا داگیرتان بکەن هەروەک چۆن کۆمەڵێکی زۆرخۆر پەلاماری سفرەیەکی خواردن دەدەن! وتیان: ئەی پێغەمبەری خواﷺ لەبەر ئەوەیە لەو ڕۆژانەدا کەمین و چاریان ناکەین؟ فەرمووی: ئەو ڕۆژانە زۆرن! بەڵام وەک کەفی سەر لافاون، هەرچی سام و هەیبەتتان هەیە لەدڵی دوژمنەکانتاندا نامێنێت و دێتە دەرەوە (هەر ئەمە نا بەڵکو) ترس و بێ هێزی یەکیش دەکەوێتە دڵتان... گوتیان ترس و بێ هێزی چی یە؟ فەرمووی: ((خۆشەویستی ژیان و ڕق بوون و حەزنەکردن لە مردن)).

شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیەی حۆرانی دەڵێت:

((پێویستە کاتێک لە (لفظ)ێک لە قورئاندا یان (حدیث)دا دەبینین، بە قسەی خواو پێغەمبەرﷺ خۆیان ڕاڤەی بکەین تا بزانین مەبەستی خواو پێغەمبەرﷺ بەو (لفظ)انە چی یە ئەو کاتە زمانی قورئان و حدیث شارەزا بین و... لە لادانی (لفظ)ەکەش لە مەبەستەکەی پارێزراو دەبین))[٢٣١]

کەواتە بۆ ڕاڤەی ئەم فەرموودەیە پێویستە بچینەوە خزمەت (قرآن وسنة) تا

---

[٢٣٠] رواه احمد وابو داود وصححه الشيخ ناصر الدين الألباني.

[٢٣١] الايمان شيخ الاسلام ابن تيمية ص١١٠ تحقيق ناصر الدين لألباني

مەبەستەکەمان بۆ ڕۆشن بکەنەوە..

پێغەمبەرﷺ لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرموێت:

((اذا تبايعتم بالعينة، وأخذتم أذناب البقر، ورضيتم بالزرع وتركتم الجهاد، سلّط الله عليكم ذلاً لا ينزعه حتى ترجعوا الى دينكم))[٣٣٢]

واتە/ هەر کاتێک دەستان دایە کڕین و فرۆشتن و بە (سود) کاریو دەستتان گرت بە کلکی مانگاوەو دڵخۆش و ڕازی بوون بە کشتکاریو وازتان هێنا لە (جیهاد)! خوای گەورە زەلیلیەک دەدات بەسەرتاندا لێتان نابێتەوە تا نەگەڕێنەوە بۆ لای دینەکەتان واتە بۆ لای جیهاد.

ئەم فەرموودانە سێ شتیان لەخۆیان گرتووە:

یەکەم: ئەو هۆیانەی کە میللەتی ئیسلام زەلیل و ژێردەستە دەکەن.

دووەم: جۆرەکانی زەلیلی، سزا خواییەکان.

سێیەم: چارەسەری ئەو دەردانەو ڕێگای ڕزگاربوون لێی.

- هۆکارەکانی زەلیلی لە هەردوو فەرموودەکەدا ((خۆشەویستی دونیاو ژیانی عەمر کۆتایی ئەم دونیایە، حەز نەکردن لە مردن و حەرام و دۆزینەوەی دەیەها فێڵ و تەڵەکە (حیلەی شەرعی) لە کاسبی کردندا)).

جۆرەکانی زەلیلی لە هەردوو فەرموودەکەدا (سوک بوون لای دوژمن و هەیبەت نەمان، زەندەق چوون لە دوژمن، بەرگە نەگرتن لە بەردەم هێرشی دوژمناندا، چاوشکێنی بوون و کزۆڵ بوون، سەرکزبوون لە ژیاندا!!!).

ڕێگە چارەکەش یەک شتە ((لا ينزعه حتى ترجعوا الى دينكم)) واتە ((الى جهادكم)) ئەمەش ئەنجامێکی سروشتی وازهێنانە لە جیهاد، خوا دەفەرموێت: ﴿الا تنفروا يعذبكم عذاباً اليماً﴾[٣٣٣]

ئەو عەزابەش ئەوە بوو کە باسمان کرد... بەڵام ئایا چۆن بتوانین ئەم کارە بەئەنجام بگەیەنین و لە کاتێکدا حاڵی موسڵمانان بە گشتی بە ئەنجامێک گەیشتووە کە هەموو

١

---

رواه ابو داود عن ابن عمر باسناد حسن وصححه الألباني.

التوبة/٣٩

حەکیمێک لێی سەرسامە. چارەسەرەکەی بەم قسەی ئیبن تەیمییە دەدەینەوە کە دەڵێت:

**((يجب الاستعداد للجهاد باعداد القوة ورباط الخيل في وقت سقوطه للعجز. فان ما لا يتم الواجب الاّ به وفهو واجب))**[٣٣٤]

واتە/ پێویستە خۆئامادە کردن بۆ جیهاد بە ئامادەکردنی هێزو بازوو و کەل و پەل و پێداویستیەکانی جەنگ، لەکاتی نەمانی جیهاددا ئەوەش لە کاتێکدا کە نەتوانرێ بە جیهاد کردن هەڵ بستن، چونکە بێ گومان هەر شتێک کە واجب بە بێی ئەو تەواو نەبێت ئەو شتەش دەبێتە واجب واتە: بۆ وەدی هێنانێ جیهاد خۆئامادە کردن ((**الاعداد**)) واجبەو پێویستە.

مەعلومیشە ئیعداد بۆ جیهاد دوو جۆرە:

١- ئیعدادی ئیمانی بە عیلمی شەرعیو تەزکیە.. خوای گەورە دەفەرموێت: **﴿يتلوا عليهم آياته ويزكيهم ويعلمهم الكتابة والحكمة﴾**[٣٣٥]

٢- ئیعدادی ماددی کە سێ شتە (**أسلحة، مال، رجال**) خوای گەورە دەفەرموێت: **﴿واعدوا لهم ما استطعتم من قوة ورباط الخيل ترهبون به عدو الله وعدوكم وآخرين من دونهم لا تعلمونهم الله يعلمهم. وما تنفقوا من شيء في سبيل الله يوف اليكم وانتم لا تظلمون﴾**[٣٣٦]

هەروەها دەفەرموێت: **﴿فقاتل في سبيل الله لا تكلف الا نفسك وحرض المؤمنين عسى الله ان يكف بأس الذين كفروا﴾**[٣٣٧]

هەر میللەت و گەلیکیش لەخۆی نەبورێت و رێگەی رزگاری نەگرێتە بەر، بەژێر دەستەیی دەمێنێتەوە، خواش بریاری تر دەدات.

**﴿الا تنفروا يعذبكم عذاباً اليماً، ويستبدل قوماً غيركم ولا تضروه شيئاً﴾**[٣٣٨]

---

مجموع الفتاوى ٢٨ ٢٥٩

جمعة ٢

الانفال

النساء

التوبة ٣٩

# وانەی چوارەم:

**عن ابن عمر رضي الله عنهما قال: قال رسول الله ﷺ:**

## من حالت شفاعته دون حد من حدود الله فقد حاد الله في أمره، ومن مات وعليه دين فليس بالدينار والدرهم، ولكن بالحسنات والسيئات، ومن خاصم في باطل وهو يعلمه، لم يزل في سخط الله حتى ينزع، ومن قال في مؤمن ما ليس فيه اسكنه الله ردغة الخبال حتى يخرج مما قال وليس بخارج[٢٣٩].

واتە/ هەرکەس تکا بکات بۆ ئەوەی سنورێکی خوا هەڵبگیرێت ئەوە دژایەتی بڕیاری خـوا دەکات، هەرکەسیش مردوو قەرزێکی بەسەرەوە بـوو لـە قیامـەتدا بـەدینارو درهـەم نایداتـەوە بـەڵکو دەبێـت یـان چاکـەی خـۆی بداتـێ یـان گونـاهی ئـەو کەسـە هـەڵبگرێت!، هەرکەسـیش موناقەشە لەسەر شتێک بکـات کـە خۆشی بزانێـت کـە هـەق نیـیە خـوا لێـی عـادزە تـا واز دەهێنێت و کۆڵ دەدات، هەرکەسیش شتێک بڵێـت دەربـارەی ئیمـانداریک و لـەو ئیمـاندارەدا نەبێت خوای گەورە دەیخاتە ناو پیسایی‌و چڵکی خەڵکی دۆزەخەوە تا لەو بوختانـە دێتـە دەرو ناشتوانێت!!.

ئەم فەموودەیە چوار گوناهی زۆر ترسناک باس دەکات:

١- تکا کردن و هەوڵ دان بۆ هەڵگرتنی سنورێک لـە سـنورەکانی خـوا، سـزاکەی: دەبێـت بەدژی خوا.

٢- نەدانەوەی قەرزو دواخستنی تا کاتی مردن، سزاکەی: ئیفلاسی قیامەت دەبێت.

٣-موناقەشەکردن لەسەر شتی ناحەق، سزاکەی خوا لەخۆی عادز دەکات.

---

[٢٣٩] رواه احمد (٢ ٣) وابو داود (٢-١١٧) والحاكم (٢-٢٧) وقال صحيح الاسناد ووافقه الذهبي السلسلة الصحيحة رقم (٤٣٧) وارواء الغليل (٢٣١٨).

٤- بوختان کردن بەدەم ئیماندارێکەوە، سزاکەی: چەقین لەناو چڵکی جەهەننەمدا.

ئەگەر سەیری هەریەکێ لەو گوناهانە بکەین بۆمان دەردەکەوێت هۆی کردنی دەگەڕێتەوە بۆ یەکێ شت (یەقین زەعیفیمان بە ئاخیرەت) ئەو کەسانەش دوورن لەم دینەو هەوڵ دەدەن کە نەکێ هەر سنورێکی خوا هەڵبگرن بەڵکو هەموو سنورەکانی خوا هەڵبگرن و بازاڕی دین بشکێنێ لەدەستی خوا دەرناچێ.

ئەو کەسانەی کە سەروەت و ماڵی موسڵمانان لوش دەدەن و حسابێکێ بۆ قیامەت ناکەن براوە نین، ئەو کەسانەی لەسەر باتڵی خۆیان شەڕی خوێناوی دەکەن و دەیانەوێت دەنگی (هەق) کپ بکەن و ئەهلی حەق بەرکەنار بکەن بۆیان ناچێتە سەرو خوای گەورە ناوچاوی پڕ خەتایان دەداتە دەستی (زەبانیە).

ئەو کەسانەش کە ئەوەی نەشیو نەکرێت بۆ موسڵمانانی هەڵدەبەستن و جۆرەها تۆمەتی ناشیرینی دەدەنە پاڵ و ئیعلامی لێ پڕ دەکەن، خوای گەورە لە دنیاو قیامەتدا ریسوایان دەکات و زەواڵی خۆیان بۆ دەنێرێت.

کافران و دوور لەدین هەرچی دەکەن بیکەن... بەڵام با موسڵمانەکان هۆشیار بن و ئەگەر تکایان کرد با بۆ هەڵگرتنی سنوری خوا نەبێت، چونکە خێری هەموو لایەکێ لە جێبەجێ کردنی سنوری خوا دایە ﴿ولكم في القصاص حياة يا أولي الألباب﴾[340]

واتە/ بۆ ئێوە هەیە لە تۆڵە سەندنەوە (**القصاص**)دا ژیان ئەی ئەوانەی کە خاوەن ژیریو هۆشن ﴿ولا تأخذكم بهما رأفة في دين ا لله﴾[341]

واتە/ بەزەییتان پێیان دا (ژن و پیاوی زیناکار) نەیەتەوە لە سنورەکانی خوادا.

- هەروەها ئەگەر قەرزی یەکێکتان کەوتە سەر با خێرا هەوڵی دانەوەی بدەن نەکێ نومێد بکەن کابرای خاوەن قەرز هەر باسی نەکات تا دەمرێت چونکە دانەوەی لە ئاخیرەتدا زۆر سەختە.

با ئیمانداران موناقەشە لەسەر (باتڵ) نەکەن و شتێکێ کە زانیان هەق بە بەرامبەرەکەیانە خێرا دانی پێدا بنێن و با گرژ بێت کە باس هاتە سەر موسڵمانێکێ، ئەگەر زۆر دڵنیا نەبووین

---

[340] البقرة/١٧٩

[341] النور/٢

له شتێک که تێیدایەو فیعلەن ناشەرعی‌یە هەر باسی نەکەین و نەکەوینە غەیبەت کردن.

ئیمامی (ذەهەبی) دەفەرموێت: ((**ما أغتبت أحداً منذ ان علمت ان الغيبة تضر أهلها**))[342]

واتە/ لەو کاتەوەی بۆم دەرکەوتوە (غەیبەت کردن) زەرەر لە غەیبەت کەر دەدات، غەیبەتی کەسم نەکردووە.

---

[342] سير أعلام النبلاء (١٢-٤٣٩).

# وانەی پێنجەم:

قال رسول الله ﷺ:

# والذي نفسي بيده لا تدخلوا الجنة حتى تؤمنوا ولا تؤمنوا حتى تحابوا، أوَلا أدلكم على شيءٍ اذا فعلتموه تحاببتم؟ أفشوا السلام بينكم[٣٤٣].

ئەم فەرموودەیە بەڵگەیەکی زەق و ئاشکرایە لەسەر ئەوەی تەنها ئیماندارەکان دەچنە بەهەشت ئەو ئیماندارانە هەم لەدڵ و هەم لە گوفتارو هەم لە کردەوەکانیاندا ئیمانی خۆیان دەسەلمێنن.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ هانمان دەدات یەکدیمان خۆش بوێت چونکە یەکتر خۆش ویستنی ئیمانداران بەشێکە لە ئیمان، وەرێگەیەکیشمان نیشان دەدات بۆ ئەوەی موسڵمانان یەکتریان خۆش بوێت ئەویش بریتییە لە سەلام کردن، لێرەدا بەڵگەی ئەوەش دەدا کە ئیمان کردەوەش دەگرێتەوە وە هیچ موسڵمانێک نابێتە ئیمانداری تەواو تا کردەوە چاکەکانی ئەنجام نەدات.

ئەوەندە بەس نییە مرۆڤ تەنها بزانێ ئیمان چییەوە چۆنە، چونکە زانین بەتەنیا کابرای پێ نابێتە ئیماندار وەک خوا دەفەرموێت: ﴿الذين آتيناهم الكتاب يعرفونه كما يعرفون أبناءهم﴾[٣٤٤]

واتە/ ((ئەوانەی کتێبمان بۆ ناردوون (گاورو جولەکە) چاک (محمد) دەناسن و دەزانن پێغەمبەرە وەک چۆن کورەکانی خۆیان دەناسن.

کەواتە هەر یەکێ زانی خواو پێغەمبەرو ئیسلام هەقن و مل کەچیو پەیڕەوی فەرمان و ئەحکام و شەریعەتی ئیسلامی نەدەکرد، بەڵکو ڕەتی دەکردەوە، ئەوا ئەو کەسە بە ئیماندار حسێب نییەو نابێتە ئیماندار، ئەگەر عیلمێک هەر ئەوەندە بێت خواو پێغەمبەری پێ بناسیو

---

[٣٤٣] رواه مسلم/ ١/ ٧٤ وغيره.

[٣٤٤] الأنعام/ ٢٠

نەبێتە پاڵنەرێک بۆ پەیڕەوو رازی بوونی بە ئەحکامی ئیسلام ئەوا هەروەکو ئەو عیلمەی لێ دێت کە کتێبی‌یەکان (اهل الکتاب) هەیانبوەو خوای گەورە ئایەتی (انعام/ ٢)ی دەرهەق ناردووە.

مرۆڤ بەوە دێتە ناو ئیسلام کە لە سەرەتاوە دان بە عەقیدەی ئیسلامی دابنێو شایەتی بە ((**لا اله الاّ الله ومحمد** رسول الله)) بدات.

هەروەها تەسلیمی هەموو شەریعەت و ئەحکامی ئیسلامیش بەو گوێرەیەی پێی گەیشتووە، ئینجا بەرە بەرە ئیمانەکەی زیاد دەبێت، ئەگەر بە فەرمانی قورئان و سوننەت بێت و ئیماندارانی خۆش بوێت و دژایەتی شوێن کەوتوانی شەیتان بکات، لەسەرمانە ساتێ -ئەگەر کەمیش بێ- لەژێر سێبەری ئەم بەشە فەرموودەیە بوەستین کە دەفەرموێت: ((**ولا تؤمنوا حتى تحابوا**)) یان ئاورێک بەلای خۆمان بدەینەوەو بزانین ئایا ئیماندارانی ئەورۆکە بەم جۆرە ئیمانی‌یە یەکتریان خۆش دەوێ؟

کە دیراسەی واقیع و حاڵی موسڵمانانی ئەم رۆژگارە دەکەین دەبینین کەمیان گرنگی یەکی عەمەلی بە بابەتی (**الحب في الله**) دەدەن، هەر یەکەی چاوی بڕیوەتە کۆمەڵە هاوبۆچوونەکەی خۆیو بیرو ئەندێشەی هەر لە بازنەی کۆمەڵ و حیزبەکەی خۆی دەخولێتەوە، دوژمنە سەرسەختەکانی ئیسلامی لەیاد چۆتەوە لەبەر ئەوەی ئەوەندە خەریکە بەگرفتە ناوەکیەکان -لەگەڵ کۆمەڵە ئیسلامیەکانی دیکە بواری ئەوەی نەماوە دژایەتی کوفری جیهانیو جولەکە پەرست و دنیاپەرست و دووڕوو و مورتەدەکات بکات!!.

خۆشەویستی ئیمانداران دەبێت عەمەلی بێت، نابێ خۆی تەنیا لە قاڵبی نەزەریدا حەشار بدات، پێغەمبەرﷺ لەم فەرموودەیەدا چۆن موسڵمانان بەرەو هەنگاوی عەمەلی یانە دەبات ((**أو لا أدلكم على شيء اذا فعلتموه تحاببتم**)) واتە ئایا شتێکتان پێ بڵێم کە کردتان یەکترتان خۆش بوێت؟ موسڵمانی وا هەیە تەنانەت کۆمەڵی وا هەیە هەر بەقسەی ڕووتی بێ کردەوەیە کە دەڵێ ئێمە براین ئەدی کوا عەمەلییەتی ئەو برایەتی‌یە؟ کوا **تطبيقى** ئەو قسەیە؟

ئێمە کە دەڵێین براین دەبێ بەو جۆرەش برابین کە خواو پێغەمبەر داوامان لێ دەکەن، نەک بەو جۆرەی کاریگەریو فشاری جاهیلیمان لەسەر بێ!... نەک برایەتی یەکی سیاسیانەی فێلاوی! بەڵکو برایەتی یەک وەکو هاوەڵە بەڕێزەکان، وەکو زانا بەڕێزەکان، وەکو ئیمامەکان،

وەکو موسڵمانە ڕاستەقینەکان بێ، لە کۆتاییدا چەند خاڵێکی گرنگ دەخەینە ڕوو کە لەم فەرموودەیەوە دەفامرێنەوە:

١- ئیمان بەتەنیا قسە نییە، بەڵکو قسەو کردەوەیە، کردەوەی نێو دڵو کردەوەی جەستەیی.

٢- گەر موسڵمانێک رقی لە کوفر نەبێتەوەو موسڵمانانی خۆش نەوێ ئەوا ئیمانەکەی ناتەواوەو گەر واش بڕوا تووشی شرک دەبێ.

٣- ئیسلام ئیمان هێنانە بەخواو کوفر کردنە بە **طاغوت**، بۆیە هەر یەکێک رقەبەرایەتی طاغوتان و دژایەتی یان نەکات ئیماندار نییە.

٤- هەر یەکێ رقی لە ئیسلام ببێتەوەو دژایەتی ئەندامانی کۆمەڵی ئیسلامی بکات ئیماندار نییە.

٥- ئەوەی تەئییدی کافران بکات و یاریدەیان بدات و قسەو قسەڵۆکیان لەپێناودا هەڵبەستێ ئیماندار نییە.

# وانەی شەشەم:

**عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: قال رسول الله ﷺ:**

## بدأ الاسلام غريباً وسيعود غريباً كما بدأ فطوبا للغرباء[٣٤٥].

**وفي بعض الروايةفطوبى**

## للغرباء الذين يصلحون ما افسد الناس من سنتي.

واتە/ (ئیسلام لەسەرەتادا بە غەریبی دەستی پێ کردوو غەریبیش دەبێتەوەو خۆشحاڵی بۆ ئەو کەسانەی بەبۆنەی ئیسلامەوە غەریب دیارن)... ئەوانەی کە خەریکی چاککردنەوەی ڕەوشتی من دەبن کە خەڵکی تێکیان داوە.

سەرنج دانمان لەم فەرموودەیەدا کۆمەڵێک ڕاستیمان بۆ دەردەخات:

١- هاتنی ئەم دینە بۆ ڕاماڵین و لەناو بردنی واقیعێکی ناسازە کە خەڵک ئولفەتیان پێوە گرتووە، بەکۆمەڵێک قسەو بڕیار لەلای خەڵک تازەن و باب و باپیرانیان شتی وایان نەکردووە، ئەوە خوای گەورە لەسەر زمانی کافرانەوە دەفەرموێت: ﴿ما سمعنا بهذا في الملة الآخرة... ان هذا الا اختلاق﴾[٣٤٦]

واتە/ ئێمە لە میللەتانی پێشووەوە ئەمانەمان نەبیستووە ئەوە شتێکی دروست کراوو دینێکی تازەیە، یان دەیان گوت: ﴿ان هذا لشيءٌ يراد﴾[٣٤٧]

واتە/ ئەمە مەبەست پێی شتێکی ترە نەک دین!! یان جاری وابوو دەیان گوت ئەمە دەیەوێت دین تێک بدات و بیگۆڕێت و خەڵکی ڕوو لەبێ دینی بکەن ﴿...أخاف ان يبدل دينكم او ان يظهر في الارض الفساد﴾[٣٤٨]

بەلام هەلگرانی بێ باکانەو بێ ئەوەی گوێ بدەنێ بەوپەڕی متمانەوە خەریکی

---

[٣٤٥] رواه مسلم.

[٣٤٦] ص/٧

[٣٤٧] ص/٦

[٣٤٨] غافر/٢٦

بڵاوکردنەوەی ئەم دینە بوون و دەیان زانی کە داهات هەر بۆ ئەم قسەو بڕیارانەیە چونکە خوا ڕاست گۆیەو ئاگادارە کە پاشەڕۆژی ئەم دینە بەکوێ دەگات.

٢- بە تێپەڕبوونی چەرخی ڕۆژگار ئەم دینە وردە وردە بەهۆی کەمتەرخەمی موسڵمانان و کزبوونی روحی جیهادو حەزکردن لە ئیسراحەت لە لایەکەوەو فرۆفێڵ و هەوڵی بێ وچانی دوژمن لە لایەکی ترەوە بەرەو غەیبی بردەوەو ئەنجامی گەیشتە ئەوەی کە تەنیا لە چەند دروشمێکی تەسکی نوێژو ڕۆژوو کەشیرەی حاجی‌یەکاندا دەبینرا... مزگەوتانێکی ساردو سڕ، بێ ئاگایی یەکی بەربڵاو لە ماناکانی دین... زۆربوونی پاڵەپەستۆی تەوژمی نەفامی... زۆربوونی لادان لەناو موسڵماناندا.

ئیدی فەرموودەو ڕەوشتە جوانەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ وای لێ هات هەرکەس باسی بکردبا لای خەڵکی بە جۆرێک سەیر دەکراو تا ئێستەش هەندێک کەس ناتوانن باسی ئیسلامەتی خۆی بکات، مەگەر کەسانێک نەبێت کە لە لۆمە نەترسن و خێرا بڕیاری ئیسلامەتی خۆیان بدەن.

٣- بەڕاستی ئەم دینە هەر هەمان غەریبایەتی ڕووی تێ کردووە...گوتراوەو تا ئێستەش هەر دەگوترێت:﴿ما سمعنا بهذا في الملة الآخرة﴾

﴿ان هذا الا اختلاق﴾

.....﴿ان هذا لشيءٌ يراد﴾

.....﴿أخاف عليكم ان يبدل دينكم او يظهر في الارض الفساد﴾

٤- هێنانەوەی بوونی ئەم دینەو دڕاندنی پەردەی غەریبی لەسەری بەوە دەبێت کە پێغەمبەرو هاوەڵانی کردیان.. چونکە ((**لن يصلح آخر هذه الأمة الاّ بما صلح به أولها**)).

لەو شتانەش:

- عاشق بوون بەم دینەو خواو پێغەمبەر ﷺ، کەس لەئێوە وا بزانم چیرۆکی ئافرەتەکەی (بەنی دینار)ی لا فەرامۆش نی‌یە کە پاش شەهید بوونی باوک و براو مێردی دەیگوت ((**كل مصيبة بعد رسول الله- جلل**)).

واتە/ هەموو لێقەومانێک دوای سەلامەتی پێغەمبەری خوا ئاسانە.

- متمانە بەخواو فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ لەهەموو بوارێکدا.

-گوێ نەدان بە لۆمەی لۆمەکەران و نەترسان لێی بەڵکو شانازی کردن بە ئیسلامەتیو بەرگی موسڵمانانەوە.

تۆ شوێن هەق کەنووی بەڵام خەڵکی شوێن خەڵکی وەک خۆیان کەوتوون کە سەرخۆش دەبن هەزار قسەی لەق و لۆق دەکەن.

- پاشان تۆ شەهید دەبی، ئەگەر خەڵک تەمەنی تەواو دەبێت، خۆ تۆ بەمردنت لە ڕێگەی خوادا تەمەنت دەست پێ دەکا، ئەگەر خەڵکی ناوی ون دەبێت و دوایی دەبڕێتەوە، خۆ تۆ لەڕێگەی خوادا دەمریو ناوت بەرز دەبێتەوەو دەبێتە هۆ بۆ زیندوو کردنەوەی جیهانێک.

٥- وەک لە فەرموودەکەدا دەردەکەوێت، زەمانێک دێت خەڵکی ڕەوشتی پێغەمبەریان لە لا بە پەسندی نامێنێت و تێکی دەدەن و قسەو بڕیاری خەڵکی تریان لا پەسەند دەبێت و بەرگری لێ دەکەن.. کاتێکیش کە پێی دەڵێیت خواو پێغەمبەر وا دەفەرموون دەڵێت خۆ فلانەکەس وا ناڵێت،... نازانێت ئەمە ڕوویەکی تری غەریبی ئیسلامە.

کەواتە گەورەترین کاری ئەمڕۆمان زیندوو کردنەوەی سوننەتەکانی پێغەمبەرە ﷺ خوا بمانکاتە ئەو کەسانەی کە لەبەر ئیسلام غەریبن و چاکی مەردایەتی لێ دەنێن بەلاوەو ڕوو دەکەنە زیندوو کردنەوەی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ ز یاساکانی ئەم دینە.

# وانەی حەوتەم:

**عن ابي هريرة رضي الله عنه قال: قال رسول الله ﷺ:**

**سبعة يظلهم الله في ظله يوم لا ظل الاّ ظله: الامام العادل، وشاب نشأ في عبادة ربه، ورجل قلبه معلق في المساجد، ورجلان تحابا في الله اجتمعا عليه وتفرقا عليه. ورجل طلبته امرأة ذات منصب وجمال فقال اني أخاف الله، ورجل تصدق أخفى حتى لا تعلم شماله ما تنفق يمينه، ورجل ذكر الله خالياً ففاضت عيناه[٣٤٩].**

واتە/ پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: خوا حەوت کۆمەڵ دەخاتە ژێر سێبەری خۆی، لە رۆژێکدا کە هیچ سێبەرێک نی‌یە بێجگە لە سێبەری خوا: پێشەوای دادگەر، گەنجێک بە عیبادەتی خوا پەروەردە بووبێت، وە پیاوێک دڵی پەیوەست بووبێ بە مزگەوتەکانەوە، دوو کەس لەبەر رەزامەندی خوا یەکتریان خۆشبوێت، هەر لەبەر خوا کۆ ببنەوەو هەر لەبەر ئەویش جیا ببنەوە، وە پیاوێک ژنێکی خاوەن ماڵ و جوان و خانەدان بانگی بکات بۆ زیناکردن ئەویش بڵێ من لەخوا دەترسم، وە پیاوێک خێرێک بکات بەنهێنی بە جۆرێکی وا کە دەستی چەپی نەزانێ کە بەدەستی ڕاستی خێری کردووە، وە پیاوێک بەتەنیا دانیشتبێ‌و یادی خوا بکاتەوەو فرمێسک برێژێت.

لە رۆژی ژیانەوەدا، لەو رۆژەی کە تەنها ئەوانەی ئیمانداروچاکەکارن لە بەهرەمەندی‌و سەرفرازی دان، تەنها ئەوانەی بەدڵی ساغ و خواپەرست و شرک نەویست ژیاونەوە، تەنها ئەوانە

---

[٣٤٩] البخاري رقم ٣٧٤ كتاب جماعة والإمامة ومسلم/رقم/١٠٣١ كتاب الزكاة

قازانج و سوودمەندن.... ﴿يوم لا ينفع مال ولا بنون الاّ من أتى الله بقلب سليم﴾[٣٥٠]

لەو رۆژەی کە خەڵکان لەناو ئارەقەکانیان دا نقوم بوون... لەو رۆژە گەرم و قرچێنەرەی کە هیچ سێبەرو نسارێکی لی نی‌یە... لەو رۆژەدا وا دەبینی چەندان جۆرە موسڵمان لەژێر سێبەری خوا دانەو بەکامەرانی‌و ئاسوودەیی‌یەوە وەستاون کە لەم فەرموودەیەدا حەوت جۆریان لێ باس کراوە کە ئەمانەن:

- **الامام العادل**: واتە خەلیفەی دادپەروەر، هەروەها ئەوانەش دەگرێتەوە کە کاروباری موسڵمانانیان بەدەستەوەیەو بەدادگەرانە ڕەفتاری تێدا دەکەن، ((عادل)یش ئەوە دەگرێتەوە کە لە هەموو کارەکانیدا فەرمانی خوا جێ بەجێ دەکات بێ کەم و زیاد.

دەبێ بزانین کە ئەم جۆرە ئیمامانە لەو وەختەوە وجودیان هەیە کە دەوڵەت حوکمی ئیسلامی بێ - واتە ئیمامەکان کار بە قورئان و سوننەت بکەن، ئنجا لە جێ بەجێ کردنی حوکمەکەدا دادگەرانە بجوڵێنەوەو بۆ خزم و کەس و کارو ئەملاو ئەولا شل نەکات.

بەڵام لە وڵاتانێکی وەکو ئەمڕۆی بەناو ئیسلامی کە حوکم بە قورئان و سوننەت ناکرێت ئەم جۆرە ئیمامانە وجودیان نی‌یە، چونکە ئەوانە بەهیچ جۆرێک بە گوێرەی فەرمانی خوا ڕەفتار ناکەن.

– **وشاب نشأ في عبادة ربه**: گەنجێک لەسەر عیبادەتی خوا پەروەردە بووبی، بۆیە گەنج ئەم پلە بەرزو بەرێزەی دراوەتێ چونکە زیاتر مەیل و ئارەزووی هەوەس دەکات، نەفسی کڵپەدارترە، شەهوەت زیاتر کاری تێ دەکات، جا ئەو کەسەی نەفس و شەهوەتی خۆی دامرکێنێتەوەو بەدوای ئارەزووی حەرام نەکەوێت و بەڵکو دێتە سەر ڕێی خواو بەرگی تەقوا دەپۆشێت، بێ فەرمانی خوا ناکات، ئەوا خوای گەورە لەژێر سێبەری خۆی ڕای دەگرێت.

– **ورجل قلبه معلق في المساجد**: پیاوێک دڵی بە مزگەوتەوە بەند بێ، واتە مزگەوتی زۆر خۆش بوێو تامەزرۆی چوونی بێ، هامووشۆی بکات، لێرەدا پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: ((**قلبه**)) بۆیە ئەوانە دەگرێتەوە کە ئەگەر چی جارو بار ناتوانن بێنە مزگەوت وەکو لەبەر نەخۆشی‌و سەفەرکردن و ئیش و کاردا بەڵام دڵیان هەر بەلای مزگەوتەوەیەو بە ئاواتی ئەوەن بۆی بگەڕێنەوە. ئەو جۆرە موسڵمانانە کە دێنە مزگەوت لەوێدا ئارام و شاد دەبن لەوێدا

---

[٣٥٠] الشعر: ٨٨ - ٨٩.

دەحەسێنەوە وەکو گوتراوە ((**المؤمن في المسجد كالسمك في الماء والمنافق في المسجد كالطير في القفص**)). موسڵمان تا لە مزگەوتێ نزیک بێتەوە ئەوەندە بە ئیمان و تەقوادارتر دەبێت، لەبەر ئەوەی نوێژەکانی بە جەماعەت دەکات برا موسڵمانەکانی دەبینێت فێری ئیسلام و علیم دەبن فێری ڕەوشت و ئادابی جوان دەبن، فێری زیکری خوا دەبن، عیبادەتیان زۆرتر دەبێت بۆیە لەسەرمان پێویستە هەرگیز لە مزگەوت دانەبڕێین.

– **ورجلان تحابا في الله اجتمعا عليه وتفرقا عليه**: دوو پیاو لەپێناو خوا یەکتریان خۆشویستبیو لەگەڵ یەکتردا کۆبوبنەوەو هەر لەو پێناوەش لە یەکتری جیا ببنەوە.

مەبەست لەو خۆشەویستی‌یە ئەوەیە کە تەنها لەپێناو خوادا بێو بەس، هیچ بەرژەوەندی یەکی دنیاییو خۆخۆیی تێ نەکەوێت.

**حافظ إبن حجر**– ڕەحمەتی خوای لێ بێ- دەڵێ: مەبەست ئەوەیە کە ئەو دوانە لەسەر خۆشەویستی‌یە دینی یەکەیان بەردەوام بن و بەرژەوەندیو تەگەرەیەکی دنیایی ئەیان پچڕێنێ، ئەگەر چی بە حەقیقەتیش لەگەڵ یەکدا کۆ نەبوبنەوە، جا تا لێک جیا دەبنەوەو دەمرن هەر حاڵیان وا بێو یەکتریان لەبەر خوا خۆش بوێ، ئەم فەرموودەیە هانمان دەدات، لەسەر ئەو کارە گرنگە کە یەکترمان خۆش بوێت، چونکە یەکتر خۆش ویستن لەپێناو خوا یەکێکە لە بەشەکانی ئیمان.

دەی برای موسڵمان تۆش هەوڵ بدە برایانی چاکەکارو دڵسۆز بدۆزەوە کە سوپاس بۆ خوا ئێستا زۆرن، نیەتت پاک بکەوە، تەنها لەبەر خوا خۆشت بوێن، نابێ لەبەر هیچ شتێکی دیکەت بێت.

– **ورجل طلبته امرأة ذات منصب وجمال فقال اني اخاف الله**: پیاوێک ژنێکی پایەدارو جوان داوای زینای لێ بکات ئەویش لەگەڵی نەکات و بڵێ من لەخوا دەترسم. بۆ ئەوەی مرۆڤ بتوانێ لەم جۆرە تاقی کردنەوانە رزگاری ببێ دەبێ ئیمانی خۆی زۆر بەهێز بکات، ترسی خوای بچێتە دڵ، بیر لە ئاکامی گوناهەکە بکاتەوە، سزای خوای بێتە بەرچاو. هەروەها خۆیشی لە نەزەرو گوناهی نزیک خەرەوە پاراستبێ، ئەگەر موسڵمانێک بەم جۆرە بێ خۆپاراستن لە ئافرەتی داوێن پیس گەلێک ئاسانە، بەڵام یەکێک هەردەم بیر لەو جۆرە کارە حەرام و گوناهانە بکاتەوەو خۆی لە نەزەر نەپاراستبێ ئەوا دەبێ لە ئیمانی خۆی بترسێ کە زەحمەتە

لەم تاقی کردنەوەیە رزگاری بکات.

– **ورجل تصدق أخفى حتى لا تعلم شماله ما تنفق يمينه:** پیاوێک سەدەقەیەک ببەخشێو بیشارێتەوە کە بەدەستی ڕاستە دەیبەخشێ دەستی چەپەی پێی نەزانێ. لێرەدا سەدەقە هەموو بەخششێک دەگرێتەوە زەکاتیش، هەروەها شاردنەوەو دەرنەخستنی سەدەقە باشترو خێرترە، وەک ئاشکرا کردنی چونکە ئیخلاس و دوورە ڕیایی لێ دێتە جێ.

– **ورجل ذكر الله كثيراً ففاضت عيناه:** پیاوێک کە بەتەنیا دوور لە خەڵکی یادی خوا دەکاتەوە جا لەبەر خۆشەویستی خوای یان لەترسی عەزابەکانی فرمێسکان هەڵبرێژێو بگرییێت.

* سەرنج: کە لەم فەرمووددەیەدا تەنها ناوی (پیاو) هاتووە مانای وا نی‌یە کە ئافرەتانیش بەشدار نین نەخێر بەڵکو تەنها لە کۆمەڵی یەکەم **(الامام العادل)**و **(ورجل قلبه معلق في المساجد)**دا نەبێ ئەوا لەوانی دیکە ئافرەتانیش دەگرێتەوە، چونکە بۆ ئافرەتان وا خێرترە لە ماڵەوە نوێژەکانیان بکەن نەک لە مزگەوت.

# وانەی هەشتەم:

**عن سهل رضي الله عنه قال: قال رسول الله ﷺ:**

## لا يؤمن احدكم حتى يحب لأخيه ما يحب لنفسه[٣٥١].

واتە/ ((کەستان ئیمانتان تەواو نابێ تا ئەوەی بۆ خۆتان پێتان خۆشە بۆ برا ئیماندارەکانیشتان پێتان خۆش دەبێ)).

- لە زۆر فەرموودەی **صحیح**دا ئەم عیبارەتە بەڕێزەی پێغەمبەرﷺ دووبارە بۆتەوە، کە فەرموویەتی ((**لا یؤمن أحدکم**)) مەبەست لەم وتەیە ئەوەیە کە ئەگەر هەر یەکێک فەرمانەکەی کە کراوە جێ بەجێ نەکات ئەوا ئیمانەکەی تەواو نابیو بەناتەواوی دەمێنێتەوە، مەبەستی ئەوە نی‌یە بە یەکجاری لە ئیمان دابڕیو ببێتە کافر.

یەکێک لە بەشەکانی ئیمان بریتی‌یە لە خۆشەویستی برایەتی ئیمانی هەر یەکێ ئیمانی هێنا پێوستە لەگەڵ براکانیدا هاودەم و هاوشاد بێت کە ئەمەش دەبێتە مایەی بەرزبوونەوەی ئیمانەکەی..

ئەم فەرموودەیە فەرمانە بۆ موسڵمانان کە هەرگیز ڕقیان لە براکانیان نەبێتەوەو ئیرەی یان پێ نەبەن، زیانیان پێ نەگەیەنن پشتیان تێ نەکەن، بەڵکو بە پێچەوانەوە خۆشیان بوێن، خۆزگەیان بۆ بخوازن، قازانجیان بۆ فەراهەم بێنن، هانیان بدەن، پشتیان بگرن.

چۆن حەز دەکات خۆی سەرکەوێت و لە ژینێکی بەختیارانەدا بێ، واش حەز بکات بۆ براکانی، هێندە ڕشت بێت لەسەر برایەتیو پاراستنی بەرژەوندی برایەکانی کە بەهیچ شێوەیەک وای لێ نەیەت حسابی موسڵمانان بفەوتێنێت، نەخوازەڵلا بۆ حیسابی جاهیلانیش بێت.

ئیماندار لای خوا نرخی لە ئاسمان و زەوی گەورەترە، کافریش بەقەد سەنگی پێشکە (مێشوولە)یەک بەهای نی‌یە، ئاخر چۆن دەبێ ئیماندار ببوغزێنرێت و کافرانیش خۆش بویسترێن؟!، دژایەتی ئیمانداران بکرێ و، دۆستایەتی کافرانیش بکرێ؟! یان ئیمانداران وەکو

---

[٣٥١] البخاري/رقم/١٣ الايمان ومسلم/رقم/٤٥/ الايمان. متفق عليه.

کافران ڕەفتاریان لەگەڵ بکرێت، کە خواش دەفەرموێت: ﴿أفنجعل المسلمين كالمجرمين ما لكم كيف تحكمون﴾؟![352] ﴿أفمن كان مؤمناً كمن كان فاسقاً لا يستوون﴾[353]

١)واتە/ ئایا چۆن دەبێ موسڵمانان و تاوانباران وەک یەک تەماشا بکەین، چیتانە چۆن حوکم دەردەکەن؟!

٢)واتە/ ئایا ئەو کەسی ئیمانداره وەک کەسێکی فاسق وایه؟ نەخێر یەکسان نین.

ئەم فەرموودەیە یەکێکە لە بنەڕەت و بناغە هەرە گرنگەکانی دینی ئیسلام لێرەدا پێغەمبەرﷺ یاوەران و گشت بڕواداران فێر دەکات خۆپەرست نەبن، چونکە ئەوە لەگەڵ ئیمان ناگونجێ، ئەوانەی ئیماندارن چاک هەست بەوە دەکەن کە هەر کاتێ ئیمان دڵان داگرێ، هەر دەست بەجێ ڕۆحی خۆپەرستی دەمرێو لەجێیدا ڕۆحی بەخشین و فیداکاریو خۆنەویستیو یەکترگری دەڕوێت.

ئیماندار دەبێ وا هەست بکات لەگەڵ براکانی یەک جەستەیە ئازاری وان ئازاریەتی، شادمانیان شادیەتی، قازانجی ئەوان قازانجیەتی بگاتە ئەوم ڕادەیەی چۆن بەرگری لەخۆی دەکات ئاواش بەرگری لە برا ئیماندارەکانی بکات، بە تایبەتی لەم ڕۆژگارەدا کە خەڵکی نەفام تێکڕا چاویان بڕیوەتە ئیمانداران و بیانبینن بیدۆڕێنن، زەمیان دەکەن دژایەتیو پڕوپاگەندەیان بۆ هەڵدەبەستن، گەر وا نەبێ ئەوا ئیمانەکەی زۆر بێ هێزو نزم و ناتەواوە.

کۆمەڵگەی ئیسلامی تاکە کۆمەڵگەیەکی بێ وێنەیە کە ئەو جۆرە یەکتر خۆشویستنەو برایەتی یەی تێدا بێت، ئەم کۆمەڵگەیە کەسانێکی تێدا پەروەردە دەبێ کە لە سەرەمەرگدا بێت خەریکی مردن بێت لە تینوان، ئینجا ئاوی بۆ بێنن و بیخەنە سەردەمی، نەیخواتەوەو بڵێ بیبەن بۆ برا برینداره‌کەی تەنیشتم، وا دیارە ئەو لەمن تینوترە؟! ئادەی کوا ئەم فیداکارییە لەکام کۆمەڵ خۆی دەنوێنێ بێجگە لە کۆمەڵگەی ئیسلامی؟! کۆمەڵگەی ئیسلامی کەسانی وای تێدا گۆش دەبێ کە لە زیندانی تاغوتەکان بە پیسترین شێواز تەعزیب بدرێن تەنها داوای ئیعتیرافی لێ بکەن، لەسەر براکانی!

ئەویش بڵێ بەخوا گەمژەن! من چۆن براکانی خۆم تووشی ئەم ئەشکەنجەیە دەکەم کە خۆم

---

[352] القلم/٣٥-٣٦

[353] السجدة/١٨

تێیدام؟! له ئەنجامدا شەهید بکرێ بەڵام تەنها تاکە پیتێکی لەدەم نەیەتە دەرەوە.

کۆمەڵگەی ئیسلامی پیاوی وا دێنێتە ئارا کە هەردەم خەمی براکانی بێ ئەگەرچی بۆ سێ ڕۆژیش بێ پارویەک نانی نەچووبێ بەگەرویدا، بەڵام کە دەنکێک خورما بدۆزێتەوە بیکات بە دوو لەت و بۆ خۆی وبراکەی بەشی بکات!!

تەنها لە کۆمەڵگەی ئیسلامی دەوەشێتەوە کە نان دەبەخشیو پێویستی خەڵک دابین دەکات لەناخی دڵیەوە پڕ بەدڵ بیبەخشیو پێی خۆش بێ بێ ئەوەی هیچ فشارو یاساشی لەسەر بێ!

﴿ويطعمون الطعام على حبه مسكيناً ويتيماً وأسيراً﴾[354]

واتە/ بەخۆشیو ئارەزووی دڵی خۆیان خواردن دەبەخشن بە فەقیرو هەتیوو ئەسیرەکان.

ئەمەش لەبەر ئەوەی بە قورئان و فەرموودە پەروەردە بوون لە کانیاوی فەرموودەکانی پێغەمبەرﷺ هەناویان فێنک کردۆتەوەو تینویەتی یان شکاندووە.

یاوەرانی یاریدەدەرانیان لەدەمی خۆیان گرتوەتەوەو بە یاوەرانی کۆچکەریان داوە،

﴿ويؤثرون على أنفسهم ولو كان بهم خصاصة﴾الحشر/٩

واتە/ (براکانیان) بەسەر خۆیاندا هەڵدەبژێرن هەر چەندە بۆ خۆشیان پێویست و موحتاج بن. کاتێک کۆچکەرەکان نزیکەی دوو سەد کەسیان لێ بێ جێو ڕێ مانەوە هەموویان لەژێر کەپرێکی ژێر مزگەوتەکەی مەدینەوە حەوانەوە، یاریدەدەران بە تاریکی شەوێ خواردنیان بۆ دەهێنان، نەوەکو خەڵک بزانیو ببێتە ڕیاکاری، پاشان نەوەکو ببێتە منەتێک بەسەر کۆچکەرەکانەوە.

(سبحان ا لله) کوا ئەمڕۆ؟! بەڵکو لەکام سەردەم شتی وا ڕووی داوە، لە ئەمڕۆی ڕۆژئاوا کە لافی مافی مرۆڤ لێ دەدات، بە هەزاران کەس بێ سەرو شوێن دەچنە ژێر خاکی مردن،لەتاوی برسیەتیو نەبوونی! کەچی بەسەدان دەوڵەمەندی زگ تێریش لە قاقای پێکەنینەو هەر ئاگای نی یە لە فرمێسکی دایک و خوێنی چاوی منداڵانی زگ بەتاڵ!

وە خوایە ئەم جارەش ئەم کۆمەڵگایەمان بۆ بگێڕیەوە کە خۆت لە وەسفتدا فەرمووتە:

[354] الانسان/٨.

﴿كنتم خير أمة أخرجت للناس تأمرون بالمعروف وتنهون عن المنكر وتؤمنون بالله﴾[٣٥٥]

واتە/ ئێوە باشترین کۆمەڵ و نەتەوەن بۆ ئادەمیزاد ڕەوانەکراون: فەرمان بەچاکە دەکەن و ڕێ لە خراپە دەگرن و باوەڕتان بەخوا هەیە.

[٣٥٥] آل عمران/ ١١٠

# وانەی نۆیەم:

عن ابي رقية تميم بن أوس الداري رضي الله عنه أن النبيﷺ قال:

## الدين النصيحة قلنا لمن؟ قال: لله، ولكتابه، ولرسوله، ولأئمة المسلمين وعامتهم))[٣٥٦].

واته/ ئایین دڵسۆزیو ئامۆژگاری یە، گوتمان بۆ کێ ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: ((بۆ خواو قورئان و پێغەمبەرو پێشەوای موسڵمانان و هەموو خەڵکی بەگشتی)).

- **تیشکی یەکەم:** کە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: (**الدين النصيحة**) مانای ئەوە نادات کە دین بریتی نی‌یە لەشتی دیکەی غەیری ئەوانەی باس کراون، بەڵکو مەبەستی ئەوەیە کە یەکێک لە بەشە هەرە دیارو گرنگەکانی ئیسلام دڵسۆزیو ئامۆژگاری یە، ئەوە وەکو ئەو فەرموودەیە وایە کە دەفەرموێت: (**الحج عرفة**): حەج عەرەفەیە. خۆ ئاشکرایە حەج کردن تەنها بریتی نی‌یە لە عەرەفە، بەڵکو زۆربەش و روکنی دیکەشی هەیە، بەڵام لێرەدا مەبەستی دەرخستنی گرنگی عەرەفەیە لە حەجدا.

- **تیشکی دووەم:**

أ) دڵسۆزی بۆ خوا: بریتی‌یە لە بڕواهێنان بە خواو شرک پەیدا نەکردن و نەترازان لەناوو سیفەتەکانی خواو پاککردنی خوا لە هەموو کەم و ناتەواوی یەک و جێ بەجێ کردنی فەرمانەکانیو خۆشویستن و رق لێ بوونەوە لەپێناو خواو جیهادکردن و ئیخلاس و دوعاکردن و هەموو ئەمرو نەهی یەک کە خوا بە ئێمەی فەرمووە.

٢) دڵسۆزی بۆ قورئان: مانای ئەوەیە بڕوا بێنێ کە قورئان لە لایەن خواوە هاتووەو بریتی‌یە لە قسەی خواو، لە قسەی بەندە ناچێت، وە بیخوێنێتەوەو لەبەری بکات و فەرمانەکانی ڕاپەڕێنێ.

٣) دڵسۆزی بۆ پێغەمبەرﷺ: مانای وایە بڕواهێنان بە پێغەمبەرایەتیو بەرگری کردن و

---

[٣٥٦] رواه مسلم.

دژایەتی کردنی هەموو دژانی پێغەمبەرﷺ بڵاو کردنەوەی سوننەت و زیندوو کردنــەوەی ڕێو شوێنی پێغەمبەرﷺ دەگرێتەوە.

٤) دڵسۆزی بۆ پێشەوایانی موسڵمانان: مانای گوێ گرتــن و گــوێ ڕایــەڵ بــوون و فــەرمان بــەری کــردن و یارمــەتی دان و ئاگـادار کردنــەوەیان لەکـەم و کــوڕی وکەمتەرخەمی‌یــەکانیان دەگرێتەوە.

٥) دڵسۆزی بۆ خــەڵکی موســڵمانان: مانــای ڕێ نیشــاندانی خــەڵک دەگرێتــەوە بــۆ هــەر کاروبارێک کە سوودو قازانجی ئاخیرەتیانی تێدا بێ.

- **تیشکی سێیەم:** برای موسڵمان وەکو لەم فەرموودەیە بۆت دەرکەوت کە دیــن هــەر بریتی نی‌یە لە ڕاپەڕاندن و جێبەجێ کردنی چەند وتەو کردارێکی دیاری کــراو، بــەڵکو بریتی‌یــە لە عەقیدەیەکی پاک و بێ گەرد بێ گومــانی نێــوددڵ و ڕەفتــارکردن بــە پێداویســتی‌یەکانی ئــەم دینە.

دین هەر ئەوە نی‌یە کە تەنیا ژیانی تاکەکان بگرێتەوەو واز لەژیانی کۆمەڵایەتی‌و سیاســی‌و ئابوری بهێنێ، بەڵکو ئــەو مەفهومانــە هــەمووی ژەهــری ڕژێنــی کوفــرن، بــۆ ئەوانــەی ئــەمڕۆ بانگەشەی ((جیا کردنەوەی دین لە دەوڵەت)) دەکەن بــرەو بــەو عــەقیدە باطڵەیان دەدەن بــۆ ئەوەی موسڵمانان لە مەیدانی ژیاندا فەرمامۆش بهێڵنەوەو بە ئارەزووی خۆیــان دەست بنێنــە کاروباری دنیاو بەهەوەستی خۆیان حەرام و حەڵاڵ دابمەزرێنن!

ئیسلام بۆ ئەوە نەهاتووە ببێتە قاڵبێکی رووت و لەناو مێشکدا گــرد ببێتــەوە، بــەڵکو بــۆ ئەوە هاتووە ژیانی خەڵک ڕاست کاتەوەو خەڵک فێری ژینی ڕاستەقینە بکات، بۆ ئەوە هاتووە پرۆگرامی ژیان بۆ گشت ئادەمیزاد دابرێژێت.

عەقیدەی موسڵمانان ئەوەیە کە ئیســلام دیــن و دەوڵەتــو جیابوونــەوەیان بــۆ نی‌یــەو هــەر یەکێکیش عەقیدەی پێچەوانەی ئەوە بی‌و دەوڵەت بــۆ دیــن نەســەلمێنێ، ئــەوا بــێ گومــان لــە عەقیدەی ئیسلامی ڕەسەن لایداوە.

ئەوانەی برەو بە عەقیدەی ((جیا کردنەوە دین لە دەوڵەت)) دەدەن با لایان ڕوون بێت کــە ئەوانە بونەتە ئەڵقەلەگوێی جولەکەکان چونکە ئەوان بوون بۆ یەکەم جار ئەم بیرەیان بەرجەســتە کردو دایان هێناو هەوڵی هێنانەوەی ئەم بیرەیان دەدا، ئەوەتا لە ســاڵی (١٩٠٤) لــە گۆڤــاری

(ئەکاسیا) ماسۆنیەکان دەڵێن: ((هەوڵدان و خەبات لەدژی دینەکان ئەو کاتە کۆتایی پێ دێ کە دین لە دەوڵەت جیا دەکرێتەوە)).

کەواتە ئەم بیرە شتێکی بێگانەو نامۆیە لە عەقیدەی ئیسلامیدا بەهیچ شێوەیەکیش جێگەی ئەم بیرە نابێتەوە، هەموو زانایانی ئیسلامی لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە خیلافەت بۆ ئەوەیە کاروباری دین و دنیا هەڵسورێنێت.

ئەو کەسانەش کە برەو بە بڵاوکردنەوەی ئەم بیرە دەدەن هەر هەمان کوفری پێشینانیان بەبا دەکەنەوە، ئەوەتا خەڵکی (مەدیەن) بانگەوازی (شوعەیب) پێغەمبەریان لەلا سەیرە! چۆن توخنی کاروبارێک دەکەوێت و قسەی لەسەر دەکات کە بۆی نییە!. با هەر نوێژ بکات و چۆنی دەیەوێت با بەئارەزووی خۆی خوا بپەرستێت، بەڵام نابێت باس لەکاری سیاسەت بکات، نەخێر دەبێت باسی نەکات!! و خۆی لێ بێ دەنگ بکات.

چۆن دەبێت دین و سیاسەت تێکەڵ بکات: ﴿قالوا يا شعيب أصلواتك تأمرك ان نترك ما يعبد آباؤنا أو ان نفعل في أموالنا ما نشاء انك لأنت الحليم الرشيد﴾[٣٥٧]

واتە/ دەیانگوت: ئەی شوعەیب ئەرێ ئەوە نوێژەکەت فەرمانت پێ دەکات کە واز لەوە بێنین کە باب و باپیرانمان دەیان پەرست یان شتێک بکەین لە ماڵ و سامانماندا کە خۆمان حەزمان لێیەتی؟

ئەمە رێبازی کوفرە یەک هەڵوێست و یەک کۆششە لە بەرامبەر ئیسلامدا، لەو سەردەمەی ئێمەشدا کەسانی وا هەن و دەڵێن: کاکە ئێمەش موسڵمانین ئەوەتا لە دەستووردا ئازادی عەقیدە بەندی بۆ کراوەتەوەو شتێکی رەوایە، هەروەها بایەخ بە دروست کردنی مزگەوت دەدەین و سەرپەرشتیان دەکەین، خۆ کەسیشمان لە نوێژو رۆژوو و حەج و زەکات مەنع نەکردووە، بەڵام هەرگیز رێگە نادەین پیاوە ئاینییەکان نزیکی سیاسەت و کاروباری حوکم گێڕان بکەونەوە.

برایانی بەرێز، دە ئێوەش هەوڵ بدەن ئەو جۆرە بیرو باوەڕانە لەباربەرن و، ئەم تێ کۆشانەی کە دەکرێت لەو پێناوەشدا بیپوکێننەوەو خوای گەورەش پشتیوانی باوەڕدارانە.

---

[٣٥٧] هود/٨٧.

## وانەی دەیەم:

**عن ابي العباس سهل بن سعد الساعدي (رضي الله عنه) قال:**

**مرّ رجل على النبيﷺ فقال لرجل عنده جالس: ما رأيــك في هذا؟ فقال: رجل من أشراف النــاس، هــذا والله حــري ان خطب ان ينكح وان شفع ان يشفع، فسكت رسول اللهﷺ. ثــم مرّ رجل آخر فقال رسول اللهﷺ: ما رأيك في هذا؟ فقال: يا رسول الله هذا رجل من فقــراء المسلمين، هــذا حــري ان خطب لا ينكح وشفع لا يشفع، وان قال ان لا يسمع لقوله، فقال رسول اللهﷺ: هذا خير من ملء الارض مثل هذا...[٣٥٨].**

واتە/ سەهل -خوا لێی رازی بێت- فەرمووی پیاوێکی دەوڵەمەند لەلای پێغەمبەرەوەﷺ رەت بوو، فەرمووی بە پیاوێکی تر: ئەم پیاوە چۆنە بەلاتانەوە؟ گوتی: ئەوە پیاوێکی خانەدانــە بەخوا ئەوە شایستەی ئەوەیە ئەگەر داوای ژن بکات ژنی بدرێتێ، ئەگەر تکایەکێ بکات، تکــای بگیرێ، ئەگەر قسەیەکێ بکات گوێ بۆ قسەکەی شل بکرێت، پێغەمبەریشﷺ بێ دەنــگ بــوو تاوەکو پیاوێکی هەژار لــە موسڵمانان لـەوێوە رەت بــوو، فـەرمووی: ئـەدی ئـەو پیـاوە چۆنـە بەلاتانەوە؟ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەوە پیاوێکە لە هــەژارانی موسـڵمانان، ئـەوە هــەقی وایە کە ژنی پێ نەدرێ، تکای نەگیرێ، گوێ لە قسەی نەگیرێ. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: دەسا ئەوەیان باشترە لەپڕ زەوی لەوێنەی ئەوی دیکەیان.

ڕاڤەی فەرموودەکە:

١- ڕاست گۆیی هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ کە دەبینین زۆر ڕاســتگۆ بــوون لەبــەردەم هــەموو

[٣٥٨] متفق عليه.

واقیعێکدا، چونکە لەڕاستیدا ئەوەیان زۆر لا ڕوون و ئاشکرا بووە کە ئەگەر بێت و ئەوان بەزمان ڕاستیش نەڵێن، ئەوا خوای گەورە بەزوویی پێغەمبەری ئاگادار دەکردەوە بە نیەتی دڵیان ئەمە لە لایەکەوە لە لایەکی دیکەشەوە ئەو هەستەیان تێدا دروست ببوو کە خوای گەورە ئاگادارو چاودێرە بەسەر هەموو نیەت و کردارێکیاندا، جا بۆیە ڕاست گۆ بوون بەوەی کە دەوڵەمەند بەچ چاوێک سەیری دەکرێ هەژاریش بەچ چاوێک سەیری دەکرێت.

٢- چارەسەرکردنی هەموو تەنگ و چەڵەمەیەک کە کۆمەڵگا تووشی بووبێت، بە جۆرێک زۆر لێزانانە، لەبەر ئەوەی هەر کاتێک پێغەمبەرﷺ ویستبێتی چارەسەری هەڵەو ناڕێکی یەکی موسڵمانان بکات بە شێوەیەکی زۆر حەکیمانە چارەسەری کردووە نموونەی ئەوەش فەرموودەکەی سەرەوەیە، کە پێغەمبەرﷺ زانیویەتی گیرۆدەی ئەوەن کە جیاوازی دەخەنە نێوان هەژارو دەوڵەمەندەوە، جا بۆ چارەسەری ئەوەش هاتووە بە شێوەی پرسیار لێ کردن چۆنە پێشەوە لێیان، تاوەکو بزانێت ئایا بۆچوونی ئەوان چۆنە بۆ ئەو مەسەلەیە؟

٣- دڵ نەوایی کردنی هەژاران و جیاوازی نەخستنە نێوان هەژارو دەوڵەمەندەوە بەوەی کە لە فەرموودەکەدا باسی لێوە دەکات، کە هەژارێک بەقەدەری پڕی زەوی باشترە لە نموونەی دەوڵەمەندێک، کەواتە قەدرو ڕێزو چالاکی لای خوای گەورە بەدڵی پاک و تاعەت و خێرو چاکەیە نەک بەگەدەو گیپاڵ: ((**انه ليأتي الرجل السمين العظيم يوم القيامة لا يزن عند الله جناح بعوضة**))[٣٥٩]

واتە/ پیاوی گەورەو قەڵەوی وا هەیە لە ڕۆژی قیامەت دەهێنرێ کەچی کێشی باڵە مێشوولەیەکی نیە لای خوای گەورە.

٤- پێغەمبەرﷺ هەمیشە حەزی بەهاوەڵایەتی‌و دانیشتن لەگەڵ هەژاراندا کردووە، هەموو کات ڕێزی هەژارانی زیاتر گرتووە کە ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە گوێڕایەڵی زیاتری خوای گەورە بوو، کە خوای گەورە داوای لێ کردووە هەمیشە هاوڕێیەتی هەژارە خواناسەکان بکات و خۆی بەند بکات بە هاوڕێیەتی ئەوانەوە، ئەوانەی کە بەیانیان و ئێواران عیبادەتی خوا دەکەن، تەنها بۆ رازی بوونی خوا نەک بۆ سوودی دنیایی، وە داوای لێ دەکات کە چاونەبڕێتە هاوڕێیەتی کەسانی دیکە.

---

[٣٥٩] متفق عليه.

﴿واصبر نفسك مع الذين يدعون ربهم بالغداة والعشي يريدون وجهه ولا تعد عيناك عنهم﴾[٣٦٠]

واته/ بەئارام بە لەگەڵ ئەوانەی لەخوا دەپاڕێنەوە بە بەیانیان و ئێواران و مەبەستیان ڕەزامەندی خوایە، وە چاوت لێیان مەبڕە.

٥- پێویستە هەژار بە نەبوونی خۆی دڵخۆش بێت و ڕازی بێت کە خوای گەورە لەڕیزی هەژاراندا دایناوە، وە هیچ کاتێک بێ تاقەتی ڕووی تێ نەکات بەهۆی نەبوونی خۆی، چونکە ئەگەر کاتێک ئێمە سەیری ژیانی پێغەمبەران و خواناسان بکەین، دەبینین بەزۆری لەڕیزی هەژاراندا بوون و بە هەژاریش دینی خوایان دەبرد بەڕێوە.

٦- نابێت موسڵمانی ڕاستەقینە بەو جۆرە بێت کە گوێ بۆ کەسێکی هەژارو بێ نەوا نەگرێ، یان داوای قبوڵ نەکات، یان بۆ مەسەلەی ژن و ژن خوازی گوێی پێ نەدرێ، بەڵام بە پێچەوانەوە کەسێکی دەوڵەمەند هەموو قسەو داوایەکی قبووڵ بکرێت، وە بە ڕێزەوە بۆی بڕوانرێت، چونکە قەدرو ڕێزو چالاکی لای خوای گەورە بەماڵی زۆر نییە، کەواتە دەبێ ئێمەش وەکو پێغەمبەرﷺ وابین کە چۆن بەچاوی ڕێزەوە ڕوانیویەتییە هەژارن و بەچاوی سووک تەماشای نەکردوون.

٧- پێویستە موسڵمانی هەژار قەناعەتی بەهەموو شتێک هەبێت، ئەگەر ئەو شتەش زۆر کەم بێت، وە مل کەچ نەکات بۆ دەوڵەمەند لەپێناوی دەوڵەمەندی دا، وە هیچ کاتێک حەز بەدانیشتن نەکات لەگەڵیاندا.

**وقالﷺ لعائشة -رضي الله عنها-: ((إيّاك ومجالسة الأغنياء))**[٣٦١]

واته/ پێغەمبەرﷺ بە عائشەی فەرموو: خۆت بپارێزە لە هاونشینی دەوڵەمەندان.

٨- هەژارێک کە موسڵمان بێت پێویستە نەبوونی لە تاعەت و عیبادەتی کەم نەکاتەوە بەڵکو دەبێت زیاتر سوپاسی خوای گەورە بکات وە داوای سەبر لە خوا بکات لەسەر نەبوونی چونکە پێغەمبەرﷺ ئەم مژدە خۆشە بە هەژاران دەدات کە هەژار پێنج سەد ساڵ پێش دەوڵەمەند دەچێتە بەهەشتەوە **((يدخل الفقراء المؤمنون الجنة قبل أغنيائهم بخمس مائة**

---

[٣٦٠] الكهف/٢٨

[٣٦١] رواه الترمذي.

عام))[٣٦٢]

٩- دەبێت هەژار هەمیشە کۆڵ نەدات لە هەوڵ و کۆششی خۆی وە ساردی ڕووی تێ نەکات بەوەی هەوڵ بدات رزق و رۆزی پەیدا بکات وەپشت بەخوا ببەستیو داوای رزقی حەڵاڵ لەخوای خۆی بکات وە سکاڵای دڵی خۆی بەس تەنها لای خوای گەورە بکات نەک لەلای خەڵک.

[٣٦٢] قال الترمذي حديث صحيح.